# پێشکەشە بە

ئەوانەی کەبەشوێن حەق‌و راستەقینەدا ئەگەڕێن.
ئەوانەی ئەیانەوێ دۆستو دوژمن بناسن.
ئەوانەی ئەیانەوێ ڕێبازی سەرکەوتن‌و سەرفەرازی ڕاستەقینە بگرنە بەر.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پیشەکی

سەدەها ساڵە گەلی هەژارو بەدبەختمان ئەمبەرو ئەوبەری پێ ئەکرێو دوژمنانی خوانەناسو سەرسەخت توانیویانە لەشێوەی مەردا خۆیان نیشان بدەنو بەشعارو دروشمی ڕازاوە لەڕواڵەتا وە کلۆرو بۆگەن لەحەقیقەتو ڕاستیا، بخەنە بەر چاو.

ئەوانەی کە داردەستی ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵات یا ڕۆژ ئاوان داردەستی ڕوس یا ئەمەریکانو لەوانەوە دەستور وەرئەگرن، ئەڵبەتە زۆر جار سەرۆکەکانیان نەبێ کەسانی سادە بەم حەقیقەتو ڕاستیە نازانن، بەڵام لەبەر نائاگاهی گەلی هەژارمان وەلەبەر سادەیی میللەتی خواناسمان زۆر جار بگرە بەناوی دینیشەوە کڵاویان ناوەتە سەرمان، جالەبەر ئەوە خۆمان بەلێ پرسراو زانی بەرانبەر خوای گەورە وەهەروەها خۆمان بە دڵسۆزیش ئەزانین بۆ گەلی مسڵمانمان لەبەرئەوە بە پێویستیمان زانی لەم کتێبە بچوکەدا ئەوەندەی کە خوا فرسەتیدا دۆستو دوژمنی پێ بناسێنین، چونکە نەناسینی دوژمن مەترسیەکی گەورەیە، وەدوژمنی زۆرزان چاک کەڵك وەرئەگرێ لەنائاگاهی هەرکەسێك یاهەر میللەتێك.

جازوربەی داروەدەستەی گرۆهو دەستە دنیاییەکان هەڵخەڵەتاونو ڕەنگە ئەورێکەیە بەڕاست بزانن یاخود مصلحەتو بەرژەوەندیان پیویست ئەکاتو ئیمانو باوەڕیان لەڕادەیەکدا نیە کە حسابێك بۆئاخرەتو قیامەت بکەن، بەڵام حەق وایە ڕۆژگار هەمو حەقیقەتێکی بوڕۆشن کردبنەوەو ماهیەتی هەمو ئەوانەمان بۆ دەرکەوتبێ، جالە ڕوانگەی ئیسلامەوە کەقورئان دەربارەی ئەفەرموێ: (افمن شرح الله صدره للاسلام فهو علیٰ نور من ربه...)

ئایا کە سێك کە خوای گەورە دڵو دەرونو سینەی گوشاد کردبێ بە ئیسلامو

ئەو لەسەر نوری خوابیّو بەنوری پەروەردگاری بڕوانیّ.. وەکو کەسانی ترە؟
وەلەسەر داوای هەندیّ لەبرایانی دڵسـوّزو غەم خـوار ئـەم چـەند لاپەڕەیەتان پێشکەش ئەکەین بەهیوای ئەوەی کەبەبیّ تعصبو ڕق ئەستوری بخـوێنرێتەوەو ڕێگەی راستیو سەرفەرازی لەدەست نەدریّ.

**کوّمەڵی غەم خوارانی گەلی کورد.**

# سەرباس

زۆر ئاشكرایە كەساڵەهایە گەلی مسلمانی كوردمان گیری خواردوە بەدەست جۆرەها دەستەو گرۆهەوە، جۆرەها حزبو كۆمەڵەوە... ماڵی وێران ئەبیٚو دەربەدەر ئەكریٚ، خوێنی ئەرێژریٚو دێهاتی كاول ئەكریٚ، شارانی بۆمباران ئەكریٚ، جەرگی دایكانو باوكان ئەسوتیٚ، ژنان بێوەژن منداڵان هەتیو ئەكەون: لیرەدا باچەند پرسیار ئاراستەی خۆمان بكەین.

باشە هۆی ئەم هەمو بەدبەختیو چارە رەشیە چیە؟ هۆی ئەم هەمو زوڵمو ستەمە كیٚیە؟

هۆی ئەم هەمو لیٚقەوماویو دەردی سەرە چیە؟

ئایا خەتای نەتەوە دراوسیٚكانمانە كەساڵەهایە بەیەكەوە بەبرادەریو ئاسودەیی ئەژین؟

یاخود خەتای ئەوەیە كەئیسلامیینو مسڵمانین؟

نەبەخوا خوێنەری ئازیز نەخەتای دراوسیٚكانمانە، نەخەتای ئیسلامیشە، بەڵكو خەتای گەورە لەوەدایە كەئیٚمە بەتەواویو رێكو پیٚكی ئیسلاممان نەكردوە بە بەرنامەی ژیانمانو رازین بەوەی كەغیری قانونو یاسای پەروەردگار حوكمو فەرمانمان بدا بەسەرا، وەهەروەهادۆستو دوژمنەكانمان بەچاكی ناناسین، كەزۆریان لەپشتی پەردەوە بەكاری ناجەوانمەردانەی خۆیان هەڵئەسن.

جائەبیٚ بپرسین..

تۆبڵیٚی دوژمنی سەرەكیمان ئەمەریكا بیٚ؟

یاروس پێ چونکه داروده‌ستەو هەواداری زۆرتره؟

یائەمەریکاو روس هەردوکیانن کەدەست لەناو دەستن بۆ دوژمنیو لەبەین بردنی گەلاتی مسڵمان؟

تۆبڵێی ئەمەریکاو روس جڵەویان لەدەست خۆیانا بێت وەلەپشتی پەردەوە صهیونی جیهانی یاریان پێ نەکات؟ وەڵامی ئەم، پرسیارانەو دەها پرسیاری تر بە پشتیوانی خوا رۆشن ئەکەینەوەو رۆژگاریش زیاتر رۆشنی ئەکاتەوە، تابەڵکو ئەمە خوایە دوژمنانی ڕاستەقینە بناسینو بێدارببینەوە لەخەوی غەفڵەت.

چونکە، دوبارەی ئەکەینەوە دوژمنەکانمان زۆر شەیتانو خوانەناسن وەچاك توانیویانە کەڵك وەرگرن لەنائاگاهیمان، وەکردویانین بەداردەست، دەمێ ئەمانەدەن بەگژ میللەتی تورکدا، دەمێ بەگژفارسدا، دەمێکیتر عەرەبدا، وەلەو لاشەوە کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانە، هەڵئەمنێن بۆ لەناوبردنمان.

## لەسەدەی بیستەمدا

نامانەوێ درێژە بدەین بەباسەکەو لەقوڵایی تاریخو مێژووەوە لەرێشەی نەتەوەکەمان و دوژمنانی بدوێین، بەڵکو تائەو ئەندازەیەی کەخوافرسەت بدات ئەوبەسەرهاتانە دەست نیشان ئەکەین کە لەم سەدەی بیستەمەدا بەگشتی وەلەم سیچل ساڵەدا بەتایبەتی بەسەرمانا هاتوە، هەر چەندە مەسەلەکە بەگشتی بەنسبەتی عالەمی ئیسلامەوە کەگەلی کوردیش بەشێکە لەو رێشەی تاریخی و مێژویی هەیە.

جا با لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەست پێ بکەین، کە لەوساڵانە دا چەندەها ئینگلیزو ئەوروپایی هاتون و گەڕاون بەوڵاتانی ئیسلامدا بەگشتی وەکوردستانی بە تایبەتی، وەبەکاری جاسوسیو سیخوڕی هەستاون و خۆیان فێری کوردی کردوەو جل وبەرگی کوردیان پۆشیوەو بگرە بویانە بەناوی فەقیەتی یەوە لەحوجرەو مزگەوتانا بەدەوری شەیتانی خۆی هەستاوە.

وەیەکێکی وەکو مێجەرسۆن خۆی کردوە بەپیاوی طاهر بگی جاف لە هەڵەبجەو ماوەیەك لەوێ بوەو نەناسراوە تارۆژێکی لەوەڵامی پرسیارێکدا لەباتی ئەوە بڵێ نەء.. ووتویەتی: نەو.. ئیتر بەبێ تحقیقو لێکۆڵینەوە هەر ئەوەندەی لەدەست هاتوە دەری کردوە...

هەروەها مستر ریچ کە لەو شەیتانتر بوەو زۆرشارو دێهاتی کوردستان چوەو بگرە فێری لەهجەو شێوەکانی زمانی کوردی بوە.

لەساڵی ١٩١٣ ز ئافرەتێکی ئینگلیز کە مهندسو ئەندازیار بووە. نێراوە بۆ

ئەوەی کە سنوری نێوان عێراق‌و ئێران لەیەك جیا بکاتەوە لەناوچـەی هەورامان‌و پێنجوێن‌و مەریوان‌دا لەسەر ڕوانگەی نەخشەیەکی تایبەتی، هەر وەکو ئـەم وولاتە مارەیی دایکی بێ، مەرزو سنوری جیا کردەوە.

وەهەروەها بۆ هەمو بەشێکی تری کوردستان نەخشەی ئـامادە کراویان پێ بو، چونکە زۆر چاك لەوە حالّی بوبون کە میللەتێکی ئازاو هوشیار هەیە لەم ناوچـەیەدا لەبەر ئەوە زۆر بە پێویستیان زانیوە بۆ بەدی هێنانی ئامانجیان سودی لێ وەرگرن، بەتایبەتی جـێیەکی جـوگرافی گرنگیشـــی هەیە، وەبڕیارەکەش وابوە کە نەیەڵن لەهیچ لایەك دەوڵەت‌و کیانی هەبێ تا لەهەمو لایەك بۆ ئــەو ئـــامانجە هەڵی‌نێن‌و ئەوەندەی تر بەدبەختی بکەن.

## لەتورکیەدا

یهـودو جـولەکە هەوڵ‌و کۆششـــێکی زۆریان‌دا لەتەك ســـلطان‌عبدالحمیدا تا قەناعەتی پێبکـــەن کەجـــێیان بکـــاتەوە لەفلســـطین‌دا.. هرتزل دامەزرێنەری بزوتنەوەی صهیونی خۆی چوە خـزمەتی‌و پێشـنهادی پارەو پوڵێکـی زۆری پێکرد کە پێشکەشی ئەکرێ بەرانبەر بەجێ‌نشین کردنی چەند خێزانێکی یهودی لەوێ.

بەڵام سلطان زۆر بەڕەقی جوابی دایەوەو دەری‌کرد. دوای ماوەیەکی‌تر قەرەصو کەجولەکەیەکی تورك بوو لەتەك وەفـدێکی ترا چـونەوە خـــزمەتی‌و پێشـــنهادی پوڵیکی زۆر زیاتریان پێکرد بۆهەمان مەبەست.. بەڵام سلطان توڕە بوو فەرموی: بۆچی فلسطین موڵکی باوکمە یا دایکـم ئیوە ئـەتانەوێ لێم بســێنن؟! فلســطین مولکی مسڵمانانە کاتی خۆی بە خوێن گیراوە، مەگەر بەخـوێن دەسـتان کەوێ.!! جا بەراستی ئەم هەلوێستەی سلطان عبدالحمید ـ ئەبێ حەق بڵێین ـ تا ئێستا ئـەو هەمو پاشاو رئیس‌و سەرۆکەی عەرەب نەیانبوەو نایان‌بێ، بەڵکـو زۆریان لەژێرەوە هاوکاری ئیسرائیل‌یان کردوەو ئەیکەن.

جا کە یهـودو جـولەکە زانیان کەسـڵطانیان بۆ نەرم نابێ کەوتنە پیلان‌و تەڵەکە وەحـزبێکیان دروسـت کرد بەناوی (جمعیە الاتحـاد والترقـــی) کۆمەڵی یەکێتی‌و پێشکەوتن کەشـعارو دروشـمەکانی ـ حُرِّیَت، عدالت، مســـاوات ـ بوو بەمەعنای

ئازادی، دادپەروەری، بەکسانی ـ کەئەم شعارو دروشمانە لەڕواڵەتا چاکن بەڵام تەوری بڕینەوەی درەختی ئیسلام بون وەئەمانە هەمان شعارو دروشمی ماسۆینە یهودیەکانن، جا بۆ ئەوەی هەرچی زوتر بەئامانج خۆیان بگەن کەلەناوبردنی دەوڵەتی عثمانی‌یەو بەش کردنی وڵاتی ئیسلامە چوون کمال ئەتاتورکیان لەوڵاتی مەغریبەوە هێنا، لەئەفسەرێکی سادەوە پێشڕەفتەیان پێ‌کردو داستانیان هەڵبەست لەئازایەتی‌و فیداکاری‌دا وەئەم شەیتانە توانی بەهۆی ئەو ئەفسەرانەوە کەگوایا ڕۆشن فکرن زیاتر حزبی اتحادو ترقی بەهێز بکا تاتوانی کوددتایەك بکاو سلطان عبدالحمید دور بخاتەوە..

ئیتر زوڕنای نەژاد پەرستی‌و بەرەڵایی برەو پێ‌دا وە هەرچی کارمەندو فەرمانبەری غیرەتورك بوو هەموی دور خستەوەو دەری کردن لەسەرکار.

ناچار ئەوانیش یەعنی میللەتانی عەرەبو کوردو غەیرە تورك، بەتایبەتی گەلی کورد هەستیان کرد بەوەی کە زوڵمیان لێ‌ئەچێ ناچار دەستیان دایە چەك بە سەرۆکایەتی شیخ سعیدی پیران..

ئیتر جەنگ بەرپا بوو لەنێوان ئەمان‌و جەندرمەکانی ئەتاتورکا، کە بەبێ ڕەحمانە فەرمانی‌دا ـ ئەڵبەتە بیرمان نەچێ لە ژێر زوری جولەکەدا کە خۆیشی لەوان بوو ـ بەکوژاندنەوەی شۆڕشەکەیان بەشێوەیەکی دڕندانە وەزۆرێك لەئەسیرەکانی لەجێ‌یەکدا کۆکردەوەو توپ بارانی کردن، وەشیخ سعیدیشیان لەسێ دارەدا وەبەم کارە ناجەوان مەردانەی توانی دەو میللەتی برای کوردو تورك بکا بەدوژمنی یەك‌و خوێنێکی زۆر بخاتە نێوانیانەوە. وەمەسەلەی نەژاد پەرستیان کرد بەداردەستو ئەم دو گەلە مسڵمانەیان لە بەرانبەر یەك بەدبین کرد.

## هەندێ لەکارو کرداری ئەتاتورك

دوای ئەوەی زوڵمو ستەمێکی زۆری کرد لەگەلانی مسڵمان وە بگرە لەگەلی تورك خۆیشی بەم کارە نامبارەکانەی خوارەوە هەستاوە:

١ـ سیاسەتی تتریك واتە کردن‌و بەتورکی ئەو نەتەوانەی کە ژێر چەپۆکیان بون بە زۆرو ملهوڕی.

٢- جیاکردونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە سیاسەت.
٣- هێنانی قانون و یاسای ئوروپایی، وسەپاندنی بەزۆر بەسەر خەڵکیدا.
٤- قەدەغە کردنی خوێندن و نوسین بەپیتو حەرفی عەرەبی وەتەنانەت قورئان و بانگی بەزۆر کرد بەتورکی، تا نەوەی داهاتو پەیوەندی ببچڕێ لەتەك ئیسلامدا.
٥- ڕەواجدان بەعەرەق و قومارو داوێن پیسی.
٦- جل و بەرگی میللی قەدەغە کردو بەزۆر جل و بەرگی ئەوروپایی بەسەرا سەپاندن وەچەندەها کاری ناجۆری تری لەم بابەتانە، وە هەدەفی سەرەکی لەم کارانە جیا کردنەوەی گەلی تورکی مسڵمان بو لەئیسلام وە بەدبین کردنی نەتەوەکانی تر بەرانبەریان و بەرانبەر ئیسلامیش.
جابەڕاستی ئەبێ حەق بڵێتین کە ئەگەر هەر بیروباوەڕو عقیدەیەکی تربوایە ئێستا ناوی لەتاریخ و مێژوشا نەمابو بەڵام دوژمنان خەیاڵیان خاوە، ئەتاتورك لەسایەی خواوە ڕەنج خەسار بوو، هێشتا خۆی مابو کە گەورەترین بزوتنەوەی ئیسلامی بەرپابو بەناوی بزوتنەوەی (نور) بە پێشەوایەتی مامۆستای خواناس سعید نورسی کە زانایەکی مسڵمانی کورد بوە، کەتوانی بەنامە پیرۆزەکانی زوربەی گەل بێدار بکاتەوە بەتایبەتی لەچینی ڕۆشنبیرانا وەدوژمنی ڕاستەقینەیان پێ بناسێنێ، وەئێستاش لەشاگردەکانی (حزبی سە/الامت) فەراهەم هاتوە کەسەروکایەتی دراوەتە دەست مامۆستای ئاگا (نجم‌الدین اربکان).
وەئەگەر فێڵ و تەڵەکەو زۆرو ستەمی حزبی جمهوری و دیمکراسی نەبوایە لەم هەڵبژاردنە دواییەدا کە سالی ١٩٧٧ دا کرا بەرندە ئەبون و قیادەو فەرمانڕەواییان ئەگرتە دەست. جا ئەوەی شایانی باسە مسڵمانانی کوردی هوشیار زوربەیان بون بە ئەندام لەو حزبە پیرۆزەداو دەست لەناو دەستن لەگەڵ براکانیان مسڵمانانی تورك بۆ بەرپا کردنی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاستەقینە کەبە پشتیوانی خوا زۆری نەماوە بەرپا بێ و ئیسلام وردە وردە تیشکی زێڕینی بەسەر جیهانی بەدبەختا پەخش کاتەوەو میللەتان هەمو ڕزگار بکات لەهەمو جۆرە ستەمو زولمێك.[1]

---

١) لەکاتێکدا کە ئەم نامیلکەیەمان لەژێر چاپدا بوو کودتایەك لەتوریکە بەرپا کرا کە هیچ شك و گومان لەوەدا نیە کە پیلانێکی ئەمەریکی ترە لە ئیسلام و مسڵمانان، چونکە چاك هەستیان کردووە، بە مەترسی لەوەی کە مسڵمانان بەم زوانە حوکمو فەرمانڕەوایی بگرنە دەست.

## لەعێراق‌دا

لەساڵی ۱۹۱۷ دا ئینگلیز عیراقی داگیر کردو وردە وردە بەرەو ناوچەکانی کوردستان کشا، وەدوڵەتێکی دروست کرد لەعێراقدا کە زوربەی عەرەب بون، جا ئینگلیز ئەوەندە شەیتان‌و زۆرزان بو ئەیزانی کەخەڵکی خۆشەویستی سەیدو عەرەبی عەرەبستانی لەدڵایە چو لەویٚ هەندیٚ کەسی هێناو بەناو کردنی بەمەلیك‌وپاشا بەڵام لەڕاستیا خۆی هەمە کارە بوو.

جا کەئینگلیز گەیشتە کوردستان خەڵکی هەروا دەست بەسراو نەبون بەڵکو بەسەروکایەتی شیخ محمود لەشکرێك پێك هێنرا هەستان بە شۆڕش دژی ئینگلیز چونکە ئەیانزانی کە کافرو داگیرکەرە، وە لەزۆر جیٚدا پیروزی‌و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، وەچەند جار شیخ محمود ئەسیر کراو دەمیٚ حەواڵەی خواروی عێڕاق‌و دەمیٚ هندوستان ئەکرا تالەساڵی ۱۹٥٦ دا بە داخی ئینگلیزەوە سەری نایەوە، تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی وەلەمزگەوتی گەورەی ئەوشارەدا ناشتیان وەخەڵکی زۆر بوی نارەحەت‌و غەمبار بون‌و هەندێکیان خۆ پیشاندانێکیان ڕێك خست (تظاهرات) کە پۆلیس بەزوریٚ بڵاوەی پیٚ‌کردن‌و هەندێکی لیٚ‌گرتن.

## نمونەیەك لەسیاسەت‌و پیلانی ئینگلیز

ئەوەی شایانی باسە کە ئینگلیز چاك ئەیزانی کە گەلانی مسڵمان هەتا قورئان لەناویانابیٚ هیچ کارێکیان بۆ ئەنجام نادریٚ لەبەر ئەوە لەکۆنفرانسی وەزیرانی بەریتانیادا گلادستونی سەرەك وەزیر قورئانێکی گرتوە بەدەستەوە ووتویەتی: تا ئەم قورئانە لەناو مسڵمانەکانا بمێنیٚ ئێمە لەخۆشمان ئەمین نەبین - یەعنی ترساوە لەوەی کە مسڵمان بین، چونکە زانیویانە کە ئەم دینە زۆر نزیکە لەفطرەت‌و رۆح‌و دەرونی ئینسانەوە، جا کەشیشێکی سەرسەخت هەستا پەلاماری قورئانەکەی داو دڕاندی، گلادستۆن پیٚی ووت: بیٚ عەقڵیٚ نەم ویست پەڕەکانی بدڕێنی، بەڵکو ئەمەویٚ لەپەڕەکانی دڵیانا قورئان بدڕێنری‌و نەهێڵریٚ.

جا دوای مشتو مڕو کۆبونەوەیەکی زۆرو بەراورد کردنی گوزارش‌و ڕاپۆرتەکانی جاسوس‌و سیخوڕەکانیان، هەروەها کەڵك وەرگرتن لەبیروڕای

کەشیش‌و حاخامی گاورو جولەکەکان (مەسیحی‌و یەهودی).. بڕیاریان دا دوای ئەوەی هەر ناوچەیەك بگرنە دەست بەسیاسەت‌و فێڵ خۆیان شیرین بکەن وەبەم کارانەی خوارەوە هەستن:

١ـ جۆرە قوتابخانەیەك دامەزرێنن کە بەرنامەو پرۆگرامی سەرچاوە لەوانەوە وەرگرێ، وەئەو مامۆستایانەش کە پەروەردەو فێرکردن لەو قوتابخانەدا ئەگرنە دەست، بە شێوەیەك پەروەرش بکرێن کە بەد بین بن بەرانبەر ئیسلام‌و هەمیشە باسی ئەوروپاو ئەمەریکاو ڕوس بکەن بۆ قوتابیان.

٢ـ دامەزراندنی سینەما لەشارەکانا وەنیشاندانی ئەو فلیمانەی کە نرخێك بۆشەرەف‌وکەرامەت نایەڵێ کە ئەوان ـ یەعنی گەلانی مسڵمان ـ زۆر بەتوند گرتویانە، وە پێویستە سینەمای گەڕۆکیش بچێ بۆ دەرەوەی شار، وە دێهات نابێ فەراموش بکرێ، وەئەبێ ژیرانە بەم کارە هەستین وردە وردە هەنگاو هەڵگرین، بزانین چ فلیمێکیان نیشان ئەدەین.!!

٣ـ کەڵك وەرگرتن لەڕادیۆ بۆ بڵاو کردنەوەی گۆرانی‌و بەرنامەی جۆر بەجۆر کەدەماری هەرزەیی لەلایەك وە نەژادپەرستی لەلایەکی‌تر بخرۆشێنێ.

وەتلویزیونیش بەوڵاتانا بڵاو بۆوە وە، بەخراپترین شێوە کەلکی لێ وەرگیرا، هەر وەکو لەزەمانی طاغوتا لێرە ئەمان بینی، وەئێستاش لەعێراق‌و تورکیەو وڵاتانی تری (بەناو) ئیسلامیدا ئەبینرێ، بەتایبەتی چونکە شەیتانەکان‌و داروودەستەی ئینگلیزو ئەمەریکاو سەهیونی جیهانی سەرپەرستی ئەکەن، ئیترزۆر بە خراپی بە دەوری خائنانەی خۆیان هەڵئەسن‌و پیلانەکە بەردەوامە!!

جوانان سەرگەرمی عەشق‌و دڵداری‌و بەدخوویی‌و قومارو عەرەق‌و هەتا بگرە هیرۆین‌و ئەفیونیش ئەکات، وەبەزۆری ئەیانەوێ ئابڕوو شەرەف بۆ ئافرەتان نەیەڵن‌و جۆری ژیانی ئەوروپاییان لاشیرین بکەن، چونکە دوژمنانی مرۆڤایەتی چاك ئەزانن کە هەر میللەت‌و گەلێك رەوشت‌و اخلاق لەناویا نەما سەرکوتی ئاسانەو دەمستە مۆیە.

٤ـ بڵاو کردنەوەی کتێب‌و ڕۆژنامەو گۆڤار وە ڕشتنی پارەو پوڵ بۆ ئەو کەسانەی کە تەرجەمەی کتێبە ئەوروپاییەکان ئەکەن دەربارەی عەشق‌و ڕابواردن، هەروەها بڵاو کردنەوەی و ێنەی ئافرەتانی سفورو نیوە ڕوت وە بگرە ڕوتی تەواو

بەھەموو وەسیلەو ھۆیەك.

٥- سووك كردنی مەلاو زانا ئاینەكان لەبەر چاوی خوێندەوارانی تازە، وەناسینیان بەوەیٚ كە كۆسپن لەرێگەی پێشكەوتن‌و ئازادیا.

٦- ناشیرین كردنی تاریخی ئیسلام بەوەیٚ كە پڕیەتی لەكوشت‌و كوشتارو تالان‌و وێران كردن، وەئەو وردە خلاف‌و ناكۆكیانەی كەبوە لەنێوان یارانی پێغەمبەردا صلی‌اللەعلیەوسلم پێویستە گەورە بكرێ‌و زیادەی پێوە بلكێنرێ.

## پیلانەكان سەری گرت

زۆر بەباشیش وە ئەمانەیان زۆر بەزیادەوە رەواجدا لەوڵاتانی ئیسلامدا بە گشتی وەلەكوردستانا بەتایبەتی پێش ئەوەی سینەما بێننە شاری سلێمانی‌یەوە چەند تیاترۆیەكیان ھێنا لەجێی حەمامی قشلەدا بەرانبەر مزگەوتی گەورەی ئەو شارە شانۆو تەرتیباتیان رێك خست‌و ئەھاتنە سەر شانۆو نیمایشی سۆرو سەمایان بەخۆرایی‌و مفتە نیشانی ئەو خەڵكەئەدا.. برادەرێك (گێرایەوە) كە چەند كەس لەكوڕانی گەڕەكی كانێسكان قسەیان كرد بەیەك بەردباران‌و پەین بارانیان كردن وەلەسەر ئەوانە پۆلیس چەند كەس لەپیاوانی گەڕەكی زیندانی كرد كە گوایە دەستیان ھەیە لەم كارەدا، بەڵام بەھۆی نارەزایی خەڵكیەوە دوای چەند رۆژێك لایان بردو ووتیان ئەم كارەمان زوو بوو ھێشتا ماویەتی؟! جاھەر لەو ساڵانەدا مامۆستایەكی ئینگلیز ھاتوە بۆ سلێمانی بۆ ووتنەوەی زمانی ئینگلیزی وەماوەی سێ ساڵ لەوێ بووە وەفێری كوردی بو بەباشی وەزۆرجار لەمەجلیسی خواجە ئەفەندی‌دا كەیەكێك بوە لەزانا ئاینی‌یەكانی ئەوكاتەی شاری سلیمانی بە شداری كردوە، جا دوای سێ‌ساڵەكە كە ویستویەتی بگەڕێتەوە بۆ ووڵاتی خۆی سەری لە خواجە ئەفەندی داوە بۆ خداحافیزی، وە لەمەجلیسەكەدا ووتویەتی: جەنابی خواجە شتێك گرێ‌یە لەدڵما ئەگەر بیلێم خیانەتە بەدەوڵەتی بەریتانیا وەئەگەر نەیلێم خیانەتە بەئێوە، دوایی ماوەیەك مات بوو ئەوسا ووتی: بڕیارم داوە كە خیانەت لەئێوە نەكەم وەئەگەر جنابت بینوسی چاكترە، ئەویش ئەمەیە كە ئینگلیز وردە وردە خۆی دائەمەزرێنێ لەنیشتمانی ئێوەدا وە دوو وەسیلەو ھۆ ھەیە كەخۆیان

لەڕاستیا چاکن بەڵام ئەم بەشێوەیەکی خراپ بەکاریان ئەهێنێ کە ئەویش قوتابخانەو سینەمایە، جا وریای خۆتان بن مەیەڵن منداڵو ڕۆڵەکانتان سەرگەردان بێ چونکە بەڕاستی ئەبینم ئەم اخلاق ورەوشتە جوانە لە نێوان ئێوەدا هەیە حەیفە لەبەین بچێو وەکو ئێمەتان بەسەربێ.!!

جا لەڕاستیا ئەمە کابرایەکی بەوژدان بوە بەڵام بەداخەوە نەخواجەو نەغیری خواجە هیچیان لەدەست نەهات بەرانبەر هێرشی دڕندانەی ئینگلیز.

جا ڕەواجێکی زۆریشیان بەبڵاو کردنەوەی وێنەی ئافرەتانی ئەوروپایی بێ ئابڕۆدا، وێنەی بریجیت باردۆو سوفیا لۆرێن کە هەردوکیان یەهودو جولەکەن کەوتە بازاڕەوە بەهۆی ئاوێنەو قوماشو شتی ترەوە، هەروەها وێنەی کچی کافرۆش کەئەڵێن سلێمانەییەو ئینگلیز ڕفاندویەتی لەزور ماڵدا ئێستاش هەرماوە کەلەلندنو پاریس چاپ ئەکران.

## بەوانەوە نەوەستان

دوای ئەوەی زوڵمی زۆریان کرد لە گەلانی مسڵمان، بە شێوەیەکی نایەکسەرییو غیر مستقیم کەوتنە دروست کردنی دەستەو گروهو احزابێك کەناوی ڕازاوەو جۆربەجۆریان هەبو کەبەخەیاڵی خۆیان ڕزگاری میللەتو وڵاتیان ئەوێ جا ئەوەی شایانی باسە کەبەتەواوی کەڵکیان لەو قوتابیانە وەرئەگرت کە ئەچون بۆ ئەوروپا بۆ تەواو کردنی خوێندنەکەیان چونکە ئەوسا دانشگا لەووڵاتا نەبو.. ئیتر لەوێ جۆرەها خزمەتی نامەشروعیان پێ ئەکراو ئەهاتنەوە بۆ وڵات ئەڵقە لەگوێی ئەوان بونو لەو حزبو تاقمانەدا دەست ڕۆی بون، وەهەمو ئەم حزبو گروهانە ئامانجو هەدەفیان دنیایی بوو، وەدوژمنی سەرسەختی ئیسلامیش بون، زۆر سەیر بوو هەتا ئینگلیز کومونیستی (شیوعیەت) یپەروەردە ئەکرد، لەهەمان کاتا فەرمانی ئەدا بەو دەوڵەتەی کە ژێر چەپۆکی بوو زیندانیان بکاو شکەنجەیان بدا وەبگرە لە سێ دارەشیان بدا تا ئەم جۆرە فکرو بیرو باوەڕانە خۆشەویست بێ لای خەڵکی، چونکە هەر شتێ بوبە مایەی زەحمەتو خوێنی بۆ ڕێژرا با ئەوپەڕی پڕوپوچیش بێ لای خەڵکی نرخو قیمەت پەیدا ئەکات.

## عێراق ساڵی ١٩٥٨ ز / ١٣٣٧ ك

له ١٤ تموزی ئـەوساڵەدا بەناو شۆڕشێك بەرپاكرا كەلەڕاستیا كودتایەك بوو بۆ چاوبەستو عبدالكـریم قـاسم هاتە سـەر كارو گەلی كوردو عەرەب لەسـەرەتاوە پشـتگیریان لیْكردو كارو كاسپیان بوبە شـعارو دروشـم دانو چـەپڵە لێدان، وەدەوڵەتی ئینگلیزو ئەمەریكا بۆ ئـەوەی زیاتر چـاو بەسـت بكـەن لەگەلی عێراق هەندێ سـوپاو لەشكـریان هێنایە لبنانو ئـوردون گوایە بەرهەڵسـتی لە كودتاكە ئەكەن، بەڵام هیچ ڕۆی نەداو عبدالكریم دەسـەڵاتی پەیدا كردو تا یەك دوو سـاڵ میللەت ئەیانویستو وێنەی لەهەمو ماڵو دوكانێكـا هەبو، بگـرە وێنەی نامبارەكی بەیەخەی زوربەی فەرمانبەرانو كرێكارانو قوتابیانەوە بوو.

جا ئەوەی شایانی باسە كە مەلامصطفی بەرزانی كە بەخـۆیو دارو دەسـتەیەوە كە سـاڵەها بوو لەڕۆسیە بوو دوای چـەند مانگێك لەكودتاكە گەڕانەوە بۆ عێراق، وەزۆری پیْ نەچو ئـەویان هەڵنا بۆ داوا كردنی هەندێ حـەقو ماف بۆ گەلی كورد لەدەوڵەتی عبدالكـریم، لەولاشـەوە دەوڵەتی عبدالكـریمیان هەڵنا كەگوێ نەداتە داواكانی گەلی كورد كەئەڵبەتە هەندێ لە داواكانی بونی نەژادپەرستیو بچـڕاندنی گەلی كوردی لیْئـەهات لەگەلی عەرەبـو بەهیچ شـێوەیەك ناوێكـی لەئیسـلامو بەرنامەی خواوە تیانەبو.

ئیتر ئـەویش بەتوندی بەرپەرچـیدایەوەو ناچـاری كردن كە بەغا بەجـێ بێڵنو بدەنە كێوەكان.. ئیتر چـەكدار كران لەلایەن ئیمپریالیزمی شـەرقو غەربەوە، چونكە ئـەوانە ئـامانجیان بەرپابونی ئـاژاوەو خـوێنرێژیـەو لەناو بردنی ئیسلامە بەم هوّو وەسیلانە، وەژێر چەپۆك خستنی میللەتانە.

بەڵێ ئیتر تانكو تۆپو تەیارە خـرانەكار بۆ وێران كردنی كوردسـتان تانكـی ئەمەریكیو تۆپو تەیارەی میگی ڕۆسی تا ٨ شـباط ١٩٦٣ ز كە ئەمجار حـزبی بەعث كودتایەكی كردو عبدالكـریمیان كوشـت وعبدالسـلام عارفیان هێنایە سـەر كار، بەڵام دوای ماوەیەك عبدالسـلام دەسـتی بەعثی كوّتا كردو چـاك سـەركوتی كردنو ڕۆی تاڵیشی تا ئەندازەیەك ئاشكرا كردن..

جا ئەو كاتە هەندێ ڕاوێژو گفتوگۆ كراو تەقەو كوشتار وستێنراو هەندێ وەعدە درا.. بەڵام زۆری نەخایان لەمانگی حـوزەیرانی هە رئـەو سـاڵەدا سـوپایەكی زۆر

ڕژایە کوردستانەوە وە سەرلەبەیانی ٩ حزیران لەسەراسەری کوردستاندا بڕیاری قەدەغەن کردنی هاتوچۆ دراو زۆر بەدڕندانە زوربەی سەربازانی بەعث کەوتنە گیانی ئەو خەڵکەو وایان گەیاند کەدوژمنایەتی لەتەك گەلی کوردا ئەکەن و چەکدارو بێ چەك پیرو جوان وەکو یەك سەرکوت ئەکران و تەڕو وشکیان بەیەکەوە سوتان، وە هەزارانیان لەتەویڵەی هێسترەکان زیندانی کرد ودەهایان بەحەق و بەناحەق لەناو برد.. وەبەم کارەیان خەڵکیان ناچار کرد کە ڕۆ بکەنە کێوەکان.. جا ئەوە سەیرە کە زەعیم صدیق کەگورگێکی بەعثبو لەپارێزگای سلێمانیدا زۆر بەدڕندانە بەرهەڵستی و بەربەرەکانێی لەتەك میللەتا کردو خەڵکێکی زۆری ناچار کرد کە بدەنە کەژو چەك هەڵگرن، دوای چەند ساڵ ووتبوی هەقی وایە گەلی کورد مەمنونی من بن چونکە ئەگەر وام نەکردایە شۆڕشەکەیان ئاوا بەردەوام نەئەبو..!!

وەئەوەی شایانی باسە ئێستا لەلەندەن ژیان ئەباتە سەر!!

جابەم خوێن ڕێژی‌یەی کەبەرپایان کرد توانیان ئەندازەیەکی زۆر ئەم دوو میللەتە برایە یەعنی گەلی کوردو عەرەب بەرانبەر یەك بەدبین بکەن چونکە لەوانیش کوشتار زۆربوو..

جالێرەشدا پیوێستە یاداوەری بکەین کەئەو دەستە نهێنی‌یەی کەئەم خوێن ڕێژی‌یەی بەرپاکرد، ئەمریکا بوو کەئەویش بەدزی‌یەوە یارمەتی (شۆرش)ەکەی ئەدا بەهۆی دەوڵەتی پاشایەتی ئێرانەوە، وەروسیە کەبەئاشکرا پێشڕەفتەترین چەکی‌دا بەدەوڵەتی عێراق وەهەموی لەکوردستانا تاقی کرایەوە. جالەهەموی سەیرتر ئەوەبو کەدەوڵەتی منغولیای کۆمۆنیستی سەربە ڕوس لەکۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکانا (سازمانی ملل) هەڵی‌دایە لەسەرمان، کەچی خێرا دەم کوت کراو نقەی لێ بڕا. بەڵام ئەگەر یهودی و جولەکەیەك لەوپەڕی دنیا شتێکی بەسەر بهاتایە، ئەم ڕێکخراوە سەری دنیای ئەهێنایەوە یەك کەگوایە حقوقی ئینسان پێ شێل کراوە، کەچی ئەو هەمو کوشتارو ماڵ کاولی‌یە لەکوردستانا ڕوی‌دا هەر باسیشیان نەئەکردو کەڕو کوێر بون لەئاستیا

جا سەهیونی جیهانی بەتەواوی دەستی گرتوە بەسەر ئەم سازمانەداو لەژێر پەردەوە ئەوان هەمەکارەن، وەکاتی خۆیشی لەسەر بڕیاری ئەوان دروست کراوەو

مەرجی‌کارمەندو فەرمانبەرانی بون هەمو سەهیونی بون.

## دەستەیەك جیابونەوە

لەسەرکورسی‌و مەقامو خۆپەسەندی جەلال طالبانی لەسالی ١٩٦٦ ز (١٣٤٥ - ك) بەخۆی‌و سەدان کەسەوە خۆیان تەسلیمی دەولەتی عێراق کرد، بەخەیالی خۆیان دوژمنەکانی گەلی کورد لەناو ئەبەن ئەوسا داوا لەدەولەتی عێراق ئەکەن کەمافی میللەت بدات، وەئەگەر سەرپێچی کرد لەتەکیا بجەنگن..!! جائەوەی پێویستە کە ڕون بکرێتەوە ئەوەیە کە جەلال طالبانی بیروباوەڕی دیمکراسی ساوی هەیە وەدین‌و ئاین بەلایەوە هیچ نرخێکی نیە - مەگەر بیەوێ کڵاو بنێتە سەر خەڵکی سادە -

وەهەرگیز دینی ئیسلام بەشایستەی ئەوە نازانێ کەبەرنامەی ژیان‌بێ بەڵکو خۆی‌و دارو دەستەی زۆر داخ لەدڵیشن بۆ ئیسلام‌و مسلمانان هەرچەندە کەم ئاشکرای ئەکەن.. یەکێکیان ووتبوی: چاك ئەم ئیسلامە بوبە کۆسپ لەڕێمانا شەرتبێ هەر ڕۆژێ دەسەڵاتمان بێ ئەوەی نوێژ بکا سەری بڕین!!

وەئەو دڕندایەتیەی کەکردیان لەشەهید کردنی برایانی مسلمانی مەریوانی‌و پاسدارانی برینداری پاوەدا شایەتی‌یەکی تاریخی و مێژویی ڕەفتاری ڕەشیانە.

جا لەوسالانەدا کە.... بون لەبەکرەجۆی نزیکی سلێمانی بنکەیان داناو بکوژو بڕ خۆیان بون بەبازاڕدا گڤو هوڕیان بوو، وەهەرکەس ڕەخنەیەکی لێ بگرتنایە لەبکرەجۆ خۆی ئەبینیەوە.

جالەباوەشی دەولەتی عێراق‌دا (دڵسۆزانە) جەنگێکی براکوژیان هەڵگیرسان، وەمیللەتی بەدبەختیان خستە ئەم بەرو ئەو بەر وەلەهەرجی‌یەکدا هەست بکرایە کە قودرەتی لایەك بەهێز ترە کەسانێکی زۆری نائاگا پەیوەندیان ئەکرد پی‌یانەوە، وەلەوە زیاتریش ئەوەبو کەزۆرێك لەزۆرزان‌و شەیتانەکان لەم ئەم بەرو ئەو بەرەدا قازانجێکی زۆریان کردو مصلحەتو بەرژەوەندی میللەتیان پێ شێل کردو لەسەر حسابی گەلی هەژارو لی‌قەوماو خۆیان دەولەمەند کرد.

جائەوەشمان بیرنەچێ کەجلال طالبانی هەمیشە لەسەفەرو گەڕاندایە بەولاتانی

ئەوروپادا وەلەوێوە فەرمان وەرئەگرێ کە چی بکا تائەم میللەتە زیاتر بەدبەخت بکا بەناونیشانی جۆر بەجۆرەوە..

جا فکرەو بیروباوەڕی نەژاد پەرستی کەجەلال و دارو دەستەی پشتگیری لێ ئەکات وای کردوە کە هەتا هەندێ توندڕەوی وا پەیا بین بەناوی کاژیك کەزۆر سەرسەختتر بون لەوان بەرانبەر ئیسلام و نەتەوەکانی تر، وەئەگەر مەرامیان خوانەخواستە بێتە دی کەبەپشتیوانی خوا نایەت چواردەوری کوردستان تەل بەن ئەکەن و بیکەن بەزیندانێکی گەورە وەکو روسیە، وەلەقسە ناپیرۆزەکانیان: ئەگەر دەسەڵاتمان پەیدا کرد هەرچی قورئان هەیە کۆی ئەکەنیەوەو بەوشترا ڕەوانەی عربستانی ئەکەینەوە تاگوێ درێژی کورد ماندو نەبێ..!!!

## زاڵمان بۆ کوێ ئەچن

بەو جۆرە ساڵانێکی تاریك و ڕەش گوزەرا بەسەر میللەتی مسڵمانی کوردا لەکوردستانی عێراق‌دا تالەساڵی ١٩٦٧ دا هەروەکو توڵەو انتقامێکی خوایی عبدالسلام عارف لەبەسرە بەخۆی و هەلیکوپترەکەیەوە سوتاو عبدالرحمن عارف هاتە جێی کە کەمێ دڵنەرم بوو.. زۆرنەمایەوە لە ١٧ تموزی ١٩٦٨ ز (١٣٤٧ ك) دا بەعسیەکان کودتا یەکیان کردو هاتنە سەرکار لەسەرەتاوە وایان گەیان کە هەمو ماف و حەقێکی گەلی کوردن ئەدەن.

کار بەدەستانی هەردولا کەوتنە قسەو گفتگو، بەڵام زوری نەخایان جەنگ دەستی پێ‌کردەوە تولی کێشا تا ١١ آذار ١٩٧٠ کە احمد حسن‌البکر خۆی بەیانی ١١ آذاری خوێندەوە کەزوربەی داواکانی گەلی دەست نیشان کردبو..

## کۆمۆنیست (شیوعی)

دوژمنانی ئیسلام لەهەمو خاکی ئیسلامدا وە لەکوردستانیشدا شان بەشانی ڕەواج دان‌بە بیروباوەڕی نەژادپەرستی ڕەواجیان بەکۆمونیستیش داوە، بوئەوەی هەمیشە میللەتی پێ لاواز بکەن و وەسیلەیەکی‌تر بێ بۆ تەفرەقە نانەوە..

چونکه ئەمان میللیەتیان زۆر لاگرنگ نیە وەهەمو خواستو ئاواتیان لەسێ شتا کۆ کردۆتەوە: نان، ماڵ، ئازادی.. نان وماڵ بەجێ‌ی خۆی.. بەڵام ئەو ئـازادیەی کەئەمانە ئەیانەوێ چۆن ئازادی‌یەکە؟!

ناچاریـن بڵێین بەخوێنەری ئـازیزمان کە ئـەمانە مەبەسـتیان هەمان ئـازادی جنیسی‌یە کە لەنێوان حـەیواناتو ئـاژەڵدا باوەو هیچ سـنورو حـدودێك نیە لەنێوانیاندا..

لەبەر ئەوە لەهەوڵو کۆششـدان کە مەسـەلەی براو خـوشكو باوكو کچ بنێنە کەنارو کۆمەڵێك فەراهەم بێنن کە لەئـاژەڵ بچـێ تا ئینسـانو مرۆڤ، وەئـەڵبەتە زۆریان یا لەنائاگاهی‌یەوە یا بەفێڵ ئەم ئاواتو خواستەیان بەچاکی دەرنابڕن..

جا قسە بەت قسـە ئـەبڕێ ئـەگەر کتێبی (پروتوکولات حکماء صـهیون) بخوێنینەوە بەئـاشکرا بۆمان ڕۆن ئـەبێتەوە کەچـۆن مارکسو فـرويد لەوان بون ڕەواجیان بە بیروباوەڕی الحـادی‌و بێ دینی داوە بەهۆی مارکسـەوە، وە ڕەواجیان بەبەرەڵایی‌و بێ ئابڕویی داوە بەهۆی فرۆیدەوە جا لەڕاسـتەقینەش‌دا ئـەو چـواردە کەسـەی کە کودتای ١٧ اُوکتوبەریان کرد سـاڵی ١٩١٧ ز سـیانزدەیان یەهـودو جولەکە بون تەنها ستالین نەبێ کەگوایە مەسیحی بوە، بەڵام ئـەویش خێزانەکەی یەهودی بووە..!! جا تێفکرە..!!

## هەر مشتە نمونەی خەرواریكە

لەشاری سلیمانی‌دا چەند کوڕە مەلایەك ڕەواجیان بەکۆمونیستی (شیوعیەت)دا کەیەکێکیان بهادین نوری‌بو کەتا ئێسـتا ئـەندامی لیژنەی مەرکەزی کومونیسـتی عێراقە، بەڵام سەیر لەوەدابو کەژنێکی جولەکەی ڕۆسـی هەبوو بەناوی مارتلین!! جـائەم کۆمونیسـتانە پیس ترین‌و شـەیتان ترین دەوریان هەبوو لەڕەواجدان بەفەسـادو خـراپکاری‌و هەڵگـەڕانەوە لەئیسـلام، وەتوانیان گەرا دانێن لەناو گەلی کوردا، بەتایبەتی دوای کودتاکەی عبدالکریم قاسم، کەسـەریان هەڵداو دروشـم‌و شعارە پوچەکانیان خستەڕوو، وەتیپێکی چـەکداریان دروسـت‌کرد بەناوی بەرگری میللی (المقاومە الشعبیە) وەجۆرەها فسادو بێ‌ئابڕویـیان کرد.. جا زۆریان بەئاشکرا

دانەکیرەیان ئەکرد لەمەلاکان، کەگوایە کۆسپن لەرێگەلای ئازادیانا..!! چونکە بەخەیاڵی پوچیان وایان ئەزانی کەمەلا نەما ئیتر ئیسلام بێ خاوەن‌و فەوتاوە، نازانن کە خوای گەورە خۆی خاوەنیەتی، وەلەغیری مەلا لەرۆشنبیران‌و مامۆستایان‌و ئەندازیاران‌و قوتابیان‌و جوتیاران‌و کرێکاران کەسانێ فەراهەم ئەهێنێ کەببن بەسەربازی ئیسلام‌و هەڵگری مەشخەڵی سەرفەرازی..

جاخۆشی‌و شادی کومونیستی عێراق زۆر دەوامی نەکرد، بەڵکو لە ٨ شباطی ١٩٦٣ ز / ١٣٤٢ ك کودتاکەی عبدالسلام عارف لەزموقی دان‌و زۆریانی کردە کونەوە، جازۆریان خۆیان گەیاندە کوردستان‌و بون بە پشتیوانێکی تری گەلی کوردی چارەڕەش..!! لەساڵی ١٩٧٠ دا کومونیستەکان بەنسبەتی کوردستانەوە بەتایبەتی بون بەدو دەستەوە، ئەوانەی سەربەچین بون لەکێوەکانا مانەوەو پشتگیری (شۆرش) یان ئەکرد وەئەوانەیان کەسەربە ڕوس بون پاڵیان‌دا بەدەوڵەتەوە وەبەناو (بەرەی نیشتمانی پێشکەوتن خوازیان) دروست کرد لەتەك حزبی بعثدا، وەبەم کارەیان بەتەواوی گەلی کوردیان لەخۆیان ڕەنجان‌و ڕوی تاڵی خۆیانیان ئاشکرا کرد..

## بەرپا بونەوەی جەنگ

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٤ ز / ١٣٥٣ ك دا کە جەنگ دەستی پێ‌کردەوە لەلایەن سوپای بعث‌و هاوکارانیانەوە کۆمونیستەکان دڵسۆزانە پشتی بعثیان گرت، ئیتر خواو ڕاسان ئەوەندەی‌تر،سوك‌و ڕسوا بون، چونکە دوایش کە(شۆڕشەکە) شکستی خوارد هۆی سەرەکی بەوان ئەزانرا. هەر چەندە هۆی زۆری هەبوو..

جا لەو ساڵەدا بعث هێرشێکی دڕندانەی تری کردە سەر کوردستان، وەئەبێ بڵێین خەڵکێکی زۆر هاتنە ڕیزی (شۆڕشەوە).

جا بعث زۆر نامەردانە کەوتە بۆمباران کردن‌و ویران کردنی شارو دێهاتەکان، بەتایبەتی شاری قەڵادزێ کە لەکاتی نیوەڕۆدا لەناکاو دوو فڕۆکەی سۆخۆی ڕوسی بۆمبارانی ئەم شارەیان کردو زیاد لە سەد کەسی بێ تاوانیان شەهید

یابریندار کرد.. وەدوای چەند ڕۆژێکی تر هەر بەو شێوەیە دوای عەسرانێك بۆمبارانی شاری هەڵەبجەشیان کردو زیاد لەچل کەسی بێ تاوانی تریان شەهید یا بریندار کرد..

ئیتر دوای بۆمباران کردنی ئەم دوو شارە ترس چووە دڵی خەڵکییەوە، لەولاوە شای نامبارەك سنووری کردەوە بۆ قبوڵ کردنی پەناهەندەو لێقەوماوان، ئیتر میللەتی بێچارەمان بەخۆیان و خێزانیانەوە خۆیان خستە ژێر باڵی چەپەڵیەوەو کەوتنە ژێر چاودێری ساواکەوە، وەلەچەند جێیەکدا دەست بەسەربون وەکو سەریاس و سەرپێڵ و کامیاران و سەوڵاوا.. وەچواردەوریان بە سوپا، وەناو چادرەکانیشیان بەساواك تەنی بوو..

جا ئەوەی جێی داخە کە هەندێ لەکاربەدەستانی (شۆڕش) لەوکاتی تەنگانەیەدا دەستیان کردبو بەڕابواردن و داوێن پیسی، وەبەلێشاو پارەو پولی ئێرانیان بۆڕژابوو.. لەودیو خەڵکی هەژار سنگی خۆی ئەدا بەگوللەوە، ئەمانیش لەعەیش و نۆشا بون..!!

**جا گەلی هەژارمان دۆستی وای بێ دوژمنی بۆچییە؟!!**

بەڵێ ژمارەی لێقەوماوان لە سەد هەزار تێپەڕی..

## شاو صدام لەجزائر

هێشتا ساڵ بەتەواوی نەگەڕابۆوە کۆتایی زستان نەهاتبو دەوڵەتە بەناو بێلایەنەکان کۆنفراسێکیان لەجزائر پێك هێنا وەلەوانا شای بێ لایەن و!! صدامی بێ لایەن!! بون و هەواری بومدین بو بەپیاو ماقوڵ و ـ ئەڵبەتە فەرمانی پێ دراوە کە بەوکارە هەستێ ـ ڕێکەوتن لەنێوان شاو صدامدا فەراهەم هێنرا. وەبەگەڕانەوەی شا بۆتاران و صدام بۆ بەغدا کەوتنە جێبەجێ کردنی.. شا داوای لەچەکداران کرد کە کۆتایی جەنگ بێنن لەتەك دەوڵەتی عێراقدا.. صدامیش عەفوی گشتی دەرکرد ئیتر ئەم هەمو شۆڕش گێڕو چەك بەدەستە وەکو بەفری کوێستان توانەوە هەر وەکو خۆیان ئەیانوت ئاش بەتاڵیان لێکرد..

بەڵێ بەو شێوەیە پیلانەکانی شەرق و غەرب سەرئەگرێ گاڵتە بە چارەنوسی

میللەتێك ئەكرێ، لەو بڕوایەدابە خوێنەری ئازیز ئەگەر ئـەمانە بیانویسـتایە حـەق دەستی میللەت بكەوێ، پێویستی بەخوێن ڕێژی نەئەكرد، بەڵام ئامانجیان تەفرەقە نانەوەو خوێن ڕشتن‌و داغ لەدڵ كردنی میللەتانە بەرانبەر یەكتر، وەبگـرە ئـامانجی سەرەكیان لەبەین بردنی ئیسلامە بەو وەسیلەو هۆیە..

جا زۆر ئاشكرایە بۆ كەسانی هۆشمەند كەزوربەی زۆری ئـەم دەوڵەتانە ئـەڵقـە لەگوێی شەرق یاغەربن، هەیانە ماوەیەك سـەربە ڕوسـە لەپڕێكـا بای ئـەداتەوە بەلای ئەمریكادا یا بەپێچەوانەوە، یاهەیانە لەڕواڵەتا سەربە ڕوسە كەچـی لەژێرەوە سەربە ئەمەریكایە یابەپێچەوانەوە. نەشای ئـەوسـا، نەصـدامی ئێسـتا جڵەویان لەدەست خۆیاندا نەبوەو نابێ، چونكە ئاشكرایە ڕەهبەری بەعث (میشیل عەفلەقـە) كە گاورە، بەڵام لەڕاستیا نۆكەری سەهیۆنی جیهانەو نەخشەی ئەوان بەریوە ئەبات وفەراهەمی ئەهێنێ‌و صدام دار دەستێتی.

لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینەڕو كە (میشیل عەفلەق) جـارێكی چـوە بۆ لای پاپ لەڕۆما ئـەویش لەبەری هەسـتاوەو ڕێزو احترامێكـی زۆری لێ گرتوەو ووتویەتی پێی: ئەی ئافەرم بەڕاسـتی ئـەوەی تۆ بەعەرەبت كرد بەئێمە نەكرا ـ مەبەسـتی تفـرقەو دورخسـتنەوەیان بوە لەئیسـلامو بەدبین كردنی نەتەوەكانی ترە بەرانبەریان..

بەڵێ بەئیمزایەكی داردەستی مێشێل (صـدام تكـریتی) كە بە حسـاب سـەربە ڕوسە وەشای ماسونی ئەڵقە لەگوێی ئەمریكاو سـەهیونی جیهـانی وەبەشـایەتی هەواری بومدین كە كرا بوو بەسەرۆكی جەزائر ئاو كرا بەسەر ئـاگرا..!! هەزاران ئـاوارە ئـاوارە بونەوە، بەرزانی ئـاش بەتاڵی لێكرد.. ئیتر مەگەر ڕۆژ گار ڕونی بكاتەوە زیاتر كە ئایا ئەویش داردەستی شەرق‌و غەرب بوە یان‌نا، چـونكە ئـەوەی كەساڵەها پەناهندە بوە لەڕوسیا وەلەم دواییەیشدا لەئـەمریكـا بوەو لەوێ وەفـاتی كردوە.. دەها نیشانەی پرسیاری گەورە گەورە ئەخـاتە بەرچـاومان؟؟ بەهەر حـاڵ ئێستا لەبارەگای خوادایەو ئەویش ئـاگایە بە هەمو نهێنی‌یەكان‌و ڕۆژگاریش زیاتر حەقیقەتمان بۆ ڕۆشن ئەكاتەوە..

## لەماوەی چوار ساڵدا

لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا ئەتوانین بڵێین جۆرە حوکمێکی زاتی (خود مختاری) درا بەکاربەدەستان و هەموی لە (شۆڕش گێڕان) بون و بکوژو بڕ خۆیان بون، دامەزراندنی خەڵکو لابردنیان لەسەرکارو دور خستنەوەو نزیك خستنەوەیان لەژێر دەستی ئەمانا بوو..

وەدروشمەو شعاریان ئەوکاتە (بەرهەمی شۆڕش بۆ شۆڕش گێران) بوو..

جا ئەمانە سەرەڕای ئەوەی کە خزمەتێکی گشتیان بۆ گەلی کورد لەدەست نەهات بەڵکو ڕەفتاریان ناجۆر بوو لەتەك کەس و کاری ئەوکەسانەدا کەخوێنیان ڕژابوو تا ئەمانە بەوکورسی‌یە بگەیەنن..

بەڕویەکی تاڵەوە هەڵەکاڵان بەسەر ئافرەتانی بێوەژن و مێرد کوژراوا، بەسەر دایکان و باوکانی کوڕ کوژراوو جەرگ بڕاوا، بەسەر هەمو کەسدا، وەهەرچی مەسەلەو گیرو گرفتێك پێش بهاتایە بۆ هەر کەس ئەبوایە لەڕێگەی پارتی بازی و حزبەوە حەل بکرایە، هەر چەندە ئەمانە پروپاگندەی میللیەت و نیشتمان پەروەریان ئەکرد بەڵام ئەوەی لەڕێزو بەرنامەیان نەبوایە بەجۆرێکی تر تەماشایان ئەکرد هەر چەندە بێ لایەنیش بوایە..

جا لەم باسە کورتەوە بۆمان دەرئەکەوێ کەهەر بەمەی کوردبیێ بەئاغاو گەورەمان، کار پێك نایەت و بەختیاری ڕۆمان تێ ناکاو ئاسودە نابین، ئەگەر ئەوکوردە خواناس و لەخواترس نەبێ و مەبەستی ڕەزامەندی خوانەبێ..

چونکە ئەوکاتە شەیتان فوو ئەکا بەلوتیاو چاوی بەرییێ خۆی نابینێ و مافی هەزاران پێ شێل ئەکات.

## ئیمپریالیزم میکرۆبەکەیە

دوژمنانی ئیسلام کەسەهیونیەتی جیهانی لەپشتی پەردەوە هەموکارێکیان پێ ئەکات چاك ئەزانن کەبیرو باوەڕە ڕەگەزپەرستی و نەژادپەرستی‌یەکان وەسیلەو هۆیەکی چاکە بۆ تەفرەقەنانەوەو دوبەرەکی بەڵکو چەند بەرەکی لەنێوان گەلانی مسڵماندا، وەگرنگیەکی زیاتریان داوە بەمیللەتی کورد بەهۆی شوێنی جوگرافی و

لەبەرئەوە لەقوتابخانەدا برەو دراوە بەو بیروڕایە، وەلە لایەکی تریشەوە ئەم میللەتە هەستی کردوە بەوەی کەبەش خوراوەو زوڵمی لیکەچێ، وەبەشێوەیەکی یەکسەری یانایەکسەری وایان بردوتە مێشکمانەوە کەدین، وە بەتایبەتی ئیسلام هۆیەکی سەرەکی یە لەبەش خوراوی و ژێر چەپۆکیمانا وەئەوروپا ئاینی نایە کەنار بۆیە پێش کەوت..!!

جا بەبێ لێکدانەوەو لیکۆڵینەوە ئەم پروپاگندەو درۆو دەلەسانەمان بەڕاست زانیو خۆمان بەوە ڕۆشن نەکردەوە کەئاینی پیرۆزی ئیسلام وەکو ئاینی گاوری دەستکاری کراو نیە کەهەزاران زوڵمی لەمیللەتان کردو (جەوازی چونە بەهەشتی پێ ئەفرۆشتن).

بەڵێ زوربەمان هەربەو چاوە تەماشای ئاینی پیرۆزی ئیسلامەمان کرد، بەڵکو لەوە ناخۆشتریش وای لیهات کەدینی گاوری ڕێزو احترام پەیدا بکا لەناو (ڕۆشنبیرەکانمان) چونکە وڵاتانی گاور پێشکەوتون..!!

هەروەها دوژمنان بەوەشەوە نەوەستان بەڵکو وایان بردە مێشکمانەوە کە ئیسلام بەشمشێر بڵاو بوتەوە.. دین، دینی گاوری یە کەئەڵێت ئەگەر دەستیان ماڵی بەڕومەتی ڕاستا، ڕومەتی چەپتی بۆ وەرگێڕە، وەئەگەر دامێنی کراسەکەتیان گرت هەمو کراسەکەتیان بدەرێ!! کەئیمپریالیزم بەم پروپاگندانە جیهانی ئیسلامی دەستەمۆ کرد بەرانبەرخۆیو زوربەی کردن بە دوژمنی ئیسلام.

## ئیمپریالیزمو کەمایەتی یە ئاینی یەکان

ئیمپریالیزم زۆر بەچاکی کەڵکی لەکەمایەتییە ئاینییەکان وەکو جولەکە (یەهود) وەگاور (مەسیحی) وەرگرتوە بۆچەسپاندنی خۆی لەلایەك وەبۆ کلۆر کردنو کرمۆڵ کردنی کۆمەڵی مسڵمانان لەلایەکی ترەوە، ئەمانە لەبزوتنەوە نەژادپەرستیو کومونیستییەکانا دەورێکی باڵایان هەبوە.

بۆنمونە قەشە یوسف لەکەنیسەی کلدانی سلیمانیدا ئەندامی لیژنەی کوشتنو بڕین بوە لەحزبی پارتی دیمکراتدا وەلە ساڵی ١٩٧٠ بەدواوە لەناو (شورش)دا

بووه دوایی خۆی گەیاندۆته فەرانسە، وە ئێستاش لەوێیە لەگەڵ سەدان قەشەی ترا خەریکی نەخشە کێشانن بۆرەواجدان بەدینی گاوری لەجیهانی ئیسلامدا، یاهیچ نەبێ مسڵمانان لەئیسلام ئەوەندەی تر دور بخەنەوە. وەئەگەر خوێنەری ئازیز شارەزاری زمانی عەرەبی بێتو ئەم کتێبانەی دەست کەوێت زیاتر باسەکەی بۆ رۆشن ئەبێتەوەو چاکتر دوژمنان ئەناسێ وەکو:

١- الغاره علی العالم الاسلامی.. محی‌الدین الخطیب

٢- المخططات الاستعماریه لهدم الاسلام.. محمد محمود صواف کەکراوە بەفارسی بەناوی (نقشەهای استعمار درراه مبارزه با اسلام)

٣- حصوننا مهدده من الداخل.. محمدحسین

٤- پروتوکولات حکماء صهیون.. محمد خلیفه التونسی

٥- اسرار الماسونیه ئەفسەرێکی تورکی

٦- الماسونیه بلا قناع

٧- التبشیر والاستعمار. مصطفی‌خالد، عمرفروغ کەکراوە بەفارسی بەناوی. نقش کلیسا در ممالك اسلامی لەلایەن مصطفی زمانی یەوە

٨- الجنایات‌الشرقیه فی‌الغرب‌کە کراوە بەفارسی بەناوی جنایاتی غربی در شرق وەچەندەها کتێبی‌تر کە مسڵمانانی دڵسۆز ئاگا ئەیان ناسن

جابۆمان دەرئەکەوێ کە ئەمانە چ نەخشەو پیلانێکیان بەدەستەوەیە.. ئەو ئەنجامەی کەبەش کردن‌و پارچە پارچە کردنی کوردستان‌و دروست بونی ئەم هەمو ددستەو گرۆهو حزبانە لەخۆیەوە نەبوە، بەڵکو دەها ساڵ لەوەو پێش نەخشەی بۆ کێشراوە، وەزۆر بەداخەوە بەهۆی نائاگاهیمانەوە توانیویانە زوربەی زۆری پیلانەکانیان جێبەجێ‌بکەن.

## پیرۆزی‌و سەرکەوتن هەر بۆ ئیسلامە

جا بەراستی هەر عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامە کە توانیویەتی‌و ئەتوانێ بەرەنگاری لێشاوی کوفرو خوانەناسی بکا، وەهەربیرو باوەڕێکی تر بوایە ئێستا ناویشی نەمابو، وەئێستاش کەلەسایەی خواوە مسڵمانان خەریکن هوشیار

ئەبنەوەو لاوان خەریکن بێدار ئەبنەوە، دوژمنانی خوا بەگەورەترین کۆسپەو دوژمنیان‌دائەنێن‌و جۆرەها نەخشە ئەکێشن بۆ لەناوبردن‌و بەرهەڵستیان، کەلێرەشدا پێویستە مژدە بدەم بەبرایان‌و خوشکانی مسڵمانی دڵسۆز هەر کێ هەن‌و لەهەر کوێ هەن.. کەئێمە خوامان لەگەڵەو پەروەردگاری مەزن پشتیوانمانە، وەئەگەر ئێمە بەتەواوی لێ‌بڕێین بۆ خوا هێز نیە بتوانێ بەرەنگاریمان بکات، وەئەگەر لەم ڕێگەیەدا توشی هەر تەنگانەو نارەحەتیەك ببین ئەوە هیچ زەرەمان نەکردوە چونکە ئامانجی ئێمە تەنها دنیا نی‌یە، بەڵکو هەریەك لەئێمە لەڕیزی کاروانێکی پیرۆزداین بەرەو پەروەردگار ئەچین وەگەورەترین ئاواتمان ئەبێ ئەوەبێ کەبەرۆی سورو لەشی خوێناوی‌یەوە بەلقای شادبین‌و بڵێین: ئەی پەروەردگاری مەزن لەپێناوی تۆدا.. لەپێناوی جێ‌بەجێ کردن‌و فەراهەم هێنانی بەرنامەکەی تۆدا ئاوامان بەسەرهاتووە..!!

## بەفریش‌بونایە ئاوا زوو نەئەتوانەوە

وەکو لەوەوپێش باسمان کرد بەئیمزایەکی شاو صدام ئاش‌بەتاڵ کراو ئەم هەمو چەکدارە وەکو بەفری گەرمیان تاوانەوەو ڕۆژێ هەزارانیان لێ‌تەسلیمی دەوڵەتی بەعث ئەبوو پەناهندەکان زوربەی زۆریان گەڕانەوە بۆ عێراق. بەڵام بەعث هەروەکو هەمو خوانەناس‌و منافقێك وەفای نەکرد بەعفوکردن‌و لێ‌بوردنە گشتی‌یەکەی، بەڵکو گەلێ کەسی بەخۆیان‌و ماڵ‌و خێزانیانەوە هەواڵەی خواروی عێراق کردو لەوێ دەست‌بەسەر بون، بەتایبەتی کاتێ کە وورەور پەیا بووەو هەندێ کەس یا لەسیاسەتی بەعث نارازی بون یادەستێك لەئارادا بوو دایانەوە کەژ، ئیتر دام و دەزگای دەوڵەتی بەعث هەرکە بیزانیایە کەسێك چوەتە دەرەوە دەست بەجێ ماڵ‌و منال‌و کەس‌و کاری بەئوتومبیلی سوپا هەواڵەی خوارو ئەکرد.

## نەخشەیەکی تازە

لەساڵی ١٩٧٧ بەدواوە دەوڵەتی بەعثی عێراق نەخشەیەکی سامناکی کێشا

کەلەرێکەوتنەکەی جەزائردا شاوصدام بڕیاریان لەسەردابو، ئەویش بچڕاندنی کوردستانی ئێران‌و عێراق لەیەکتر بۆمسافەی ٢٠ کیلومتر لەناو سنوری عێراقدا.. جادەست‌کرا بەدروست کردنی چەندەها کۆمەڵە خانو لەدەشتەکانا، وەهەر کۆمەڵە خانویەك لەنێوان هەزار ماڵ‌و دوهەزار ماڵ‌دا بوو، وەنەخشەی خانوەکان بەشێوەیەك بوو کەوەسیلەیەك بێ بۆ برەودان بەفەسادو بەداخلاقی لەنێوان خێزانەکانا، وەهەموی بەپاڵ یەك‌و بێ حەوشە دروست‌کرا. وەلەماوەی ساڵێکدا بەپەلە پڕۆزێ تەواو کرا..

## چۆن دێهاتەکانیان گواستەوە

هەردێیەك کەبڕیاری گواستنەوەی ئەدرا، سەرلەبەیانی زوو سوپا بەتانك‌و تۆپ‌و سەربازێکی زۆرەوە دەوری دێی قوربەسەریان ئەداو سەرباز ئەکەوتە ناو دێوە وە بەزۆرو هەڕەشە ئەیان بردن‌و سواری ئوتومبیلی سوپاییان ئەکردن‌و نەیان ئەهێشت بێجگەلە هەندێ جل‌و بەرگ‌و لباس هیچ لەتەك خۆیانا بێنن، دوای ئەوە کە کەس لەناودێدا نەئەماو هەمو ماڵ‌و منداڵ‌و دانیشتوانی ئاوایی چاو پڕفرمێسك‌و نارەحەت ئەهێنران بۆهەواری تازە..!! ئەوسا سەرباز دینامیتی لەبن دیواری خانوەکان‌و کانیاوەکانا یەکە یەکە دائەناو لەیەك کاتا هەمو دێ‌کەیان ئەتەقاندەوە.. تەناتەت رەحمیان بەمزگەوتانیش نەکرد، وەبگرە رێزیان لە قورئانەکانی ناومزگەوتەکەش نەگرت، چونکە لەکاتێکا مامۆستای ئاوایی‌یەك ویستبوی بچێ قورئانەکان دەربێنێ ئەفسەرێك‌نەیهێشتوە کەیابەعثیەکی عەفلەقی بوە یا کۆمۆنیستو خوانەناس بووە کەبەداخەوە زوربەی زۆری ئەفسەرانی عێراق لەو دو دەستەیەن.

هەیان بو ئەیوت: کە قورئان عەرەبی‌یەو، قورئانی خۆمانەو ئەیسوتێنین بەئێوچی؟.

جاسەیرکە خوێنەری ئازیز کە ئیمپریالیزم چشاگردانێکی هەیەو چدارو دەستەیەکی لەناوجیهانی ئیسلامدا پەروەرش کردوە.

بەڵێ بەو شێوەیە زیاد لەهەزار دێ کاول کراو تەخت‌کرا، جا ئەوەی شایانی

باسە کەئەفسەرە بەعثیە سەرسەختەکان بەهیلیکوپتر بەسەر دێهاتە کاولەکانا ئەگەڕان و فیلمیان لێ ئەگرت وە ئەگەر دیوارێك چاك تەخت نەبوایە محاکمەی ئەو ئەفسەرو سەربازانەیان ئەکرد کە بەچاکی کاریان ئەنجام نەداوە..!!

## بەعث خزمەت ئەکا بەئاوارەکان!!

جا وەکو مەسەلە کوردی‌یەکە ئەڵێ باقسەیەکیش بۆ دز بکەین، ئەویش ئەمەیە کە دوای گەیشتنی لی‌قەوماوان بەهەواری تازەیان!! ٥٠٠ دینار پێشکەش بەهەرماڵێك ئەکرا لەتەك هەندێ زەخیرەدا..

بەڵام خەڵکی ئاواتە خواز بون کەئەگەر بیانبوایە هەزاران دیناریان بدایە بەدەوڵەتی بەعثو ئاوا لەشوێنەواری باوو باپیرانیان هەڵنەکەنرانایە.

## دوای سەرکەوتنی شوڕشی ئێران

لە ٢٢ بەهمەنی ١٣٥٧ ك. هەتاوی‌دا کەرێکەوتی ١١ شباطی ١٩٧٩ ز بو شوڕشی ئێران سەرکەوتو ڕژێمی شاهنشاهی ٢٥٠٠ ساڵە ژێرەوژور کرا....

ئیتر صدام ـ ئەوخوێن مژەی گەلی کورد ـ بوبە دۆستی گەلی هەژارمان و کەوتە گەڕان بەکوردستانی عێراق‌دا، سەیر لەوەدابو سەری ئاوارەکانی دەستی خۆیشی ئەدا وەبۆ ئەوەی دڵیان بێنێتەوە جێ پارەو پولێکی زۆری بۆ ڕشتن و کەوتە بژاردنی خەسارەت بۆیان.

وەدڵسوزی صدام بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو بوبە پشتگیرو غەم خواری گەلی کورد لەئێرانداو زوڕناکانی خستەکار کە گوایە گەلی کورد لەئێران زوڵمی لێ ئەچێو، دەوڵەتێکی نەژاد پەرستی بەرپابوە، باشە بائێمە لێرەدا پرسیارێك لەصدام بکەین، ئایا ڕژێمی شاهنشاهی چاکتر بو یائەم ڕژێمە هەر چونێك بێ،؟ ئایا شا چاکتر بو لەمان؟ بۆ لەزەمانی ئەودا هەرناو لەکوردەوە لەئێراندا نەئەبراو، بەنەبو دائەنرا؟ ئایا بەعث نەژادپەرستە یائەمان؟ خۆ تا ئێستا، انسان ئەبێ حەق بلێ ناوێکیان لەنەژادی فارسی‌یەوە نەبردوە، بەڵکو ئەمەریکاو داردەستەکانی کە صدام

یەکێکیانە ئەیانەوێ دەوڵەتی‌نەژاد پەرست فەراهەم بێنن..

ئیتر بەعث دەرگای سنوری خستە سەرپشت‌و پێشـوازیەکی گەرمی کرد لەهەمو ساواکی‌و خوێن مژو گۆرانی بێژو خوێڕی‌یەك، وەبەفەرمانی ئاغاکانی کەوتەخزمەت کردنیان‌و قەڵەو کردنیان.

## کوردستانی ئێران

لەکاتی جەنگـی جیهـانی دوهەمدا سـاڵی ١٣٢٠ ك هەتاوی بەرانبەر سـاڵی ١٩٤١ ز روسـیە کوردسـتانی ئێرانی خسـتە ژێرچـاودێری‌یەوەو بڕیاری‌دا کەپشتگیری بکا لەبەرپابونی کۆمارێکـی سـەربەخـۆ لەکوردسـتانی ئێراندا، کە لەوکاتەدا دەسـت کرابو بە پروپاگندە بۆی بەتایبەت لەلایەنی ئـەو دەسـتەو گرۆهانەوە کە سەربە رۆس بون.

قاضی محمد کەیەکێ بو لەئەندامانی حزبی دیمکرات لەتەك سەیفی برایا لەبەر ئەوەی کەرواڵەتێکی دینی‌یان هەبو ـ وەئەوسـا دین قـەدری هەبولای خـەڵکـی ـ هەڵبژێران بەنمایندەی ئەوناوچەیە. وە وردە وردە حزبی دیمکرات لەئـازربایجانیشا دەسەڵاتی پەیاکرد.

لەساڵی ١٣٢٤ دا یەکێك بەناوی (جعفر پیشوری) کە لەدارو دەستەی رۆس‌بوو دەوڵەتی خود مختاری خـۆی پێك هێنابو، دەعوەتی لەقـاضی محمدو سـیفی برای کردو لەتەبریز، لەتەك کونسوڵی روسوا کۆبونەوەو دوایی بە ـ ترام ـ یێکـی تایبەتی بەرەو باکۆ چون‌و لەوێ بەسەرۆکی حزبی کومونیسـتی ئـازربایجانی روسیـە جعفر باقروف گەیشتن..

ئەوەشمان بیرنەچێ کەلەوکاتانەدا حزبی تودەی سـەربەرۆس پشـتیوانی خـۆی دەبڕی لەحزبی دیمکراتو حزبەکانی تری سەربەئاغای..!!

## کۆمەڵە.. تا.. کۆمەڵە

جاپێش ئەوەی رۆس دەست بەکار بێ، بەهۆی جەورو سـتەمێ کەلەگەلی کورد

کرابو بزوتنەوەیەك بەناو (کۆمەڵە) ژ.ك بەرپا بوو.. کەئـەڵبەتە زۆر دورە لەم گروهو دەستەیەی کەئێستا ناوی خۆیان ناوە (کۆمەڵە)، چونکە ئەمانە مائوین و سەربە چینن، هەروەها پێ باوەڕو خوانەناسن..

بەڵام (کۆمەڵە)ی ئەوسا زوربەیان لەمەلاو فەقـێ رۆشـنبیرەکان بون و رۆواڵەتی ئیسلامیان ئـەندازەیەك هەبو، وەهەر لەبەرئـەوەش بوو کەرۆوســی کومۆنیســت ئارامی لێهەڵگیراو دەستی خســتە کاریانەوەو توانی لەســادەییان کەڵك وەرگرێو بەدۆست، خۆی نیشانیان بدا.. وەقـاضی محمد بەوە ڕازی بکـەن کەحـزبێك بەرپا بکا بە ناوی دیمکراتەوەو، داوای خودمختاری (حوکمی زاتی) بکا بۆ کوردســتان و دیمکراسی بۆ ئێران..

وەکە لەباکۆ گەڕایەوە لای جعفـر باقـروف ئـەوەی ئـاشکرا کرد، وەوا دیار بوو رۆس وەعدەی پشـتیوانی تەواویان دابویە.. براو خــوشکانی ئــازیز لێرەدا ئــەم پرسیارانە یەخەمان پێ ئەگرێت: چ دەس و پیلانێك لەئارادا بووە؟

ئەم هامشوو بەیەك گەیشتنە، تۆ بڵێی لەبەر چاوی کاڵی گەلی کورد بوبی؟ ئەبێ چ عەقیدەو بیرو باوەڕێك پاڵیان پێوەنێ تالەو سەرەوە بین بەدڵسوزمان؟ یا ئەوانیش فەرمان پێ کراون؟

## کۆماری مەهاباد اعلان کرا

لە ١٣٢٤/٩/٢٦ دا دوای چـەند رۆژێك کەئـازربایجان اعلانی خــود مختاری کرد، قاضی محمد لەتەك سێ ئـەفســەری روســیدا کۆبونەوە، ملا مصــطفیی بەرزانیش بەشداری کردن، وەدوای کۆبونەوەکە اعلانی کۆماری مەهابادیان کردو دوایی حزب قاضی محمدی پەسەند کرد بەسەرۆك کۆمار.

جا دوای چـەند رۆژێك پێنج کەس لەســەرۆك عەشــرەتەکانی کوردســتان کە قاضی محمدو ملامصطفی دوان بون لەوان جل و بەرگـو لباسی مارشالیان پۆشی، هەروەها صلاح‌الدین کاظموفی قەفقـازی کەئـەفســەری روس بوو بەناوی کاك ئاغا لەناو یانا دەســت بەکار بوو..!! زۆرســەیرە روس بو بە پشــتیوان و یاریدەدەری دەوڵەتێك کەبونی نەژادی زیاتر لێ ئــەهات تا کۆمۆنیســتی.. بەڵام تۆ بڵێی تا

سەربیّو پیلانیّکی گەورەیان لەژیرّ سەرا نەبیّت..؟!

## کۆماری مەهاباد تەمەنی زۆر کورت بوو

بەڵیّ ساڵیّ نەگەرّایەوە رّوس پشتی هەڵکردو ئـەوسـوپاو هیّزەی کە هیّنابوی بۆ پشتگیری کۆماری مەهاباد کیّشایەوەو سەنگەری چۆڵ کرد بۆ لەشکری پاشایەتی تاوانبار کە زۆر بەدرّاندانە هیّرشـی کردە سـەر کوردسـتان بەگشـتی وەمەهاباد بەتایبەتی، وەپیشەوری کە لە ئازربایجان کرابو بەگەورە زوو فریای خـۆی کەوتو هەڵات بۆ رّوسیە..

لە ١٣٢٥/٩/٢٦ دا قاضی محمدو هاوریّەکانی دەستگیر کران. جا دەوڵەتی رّوس نقـەی لەخـۆی برّی هەر وەکو هیچ رّوی نەدابیّ لەگەڵ رژیّمی ئـەوسـای ئیّراندا لەسەر ئەوە ریّکەوتبون کە بایی ١١٠ ملیون دۆلار چـەکی لیّبکـریّ جـابە احتمالی زۆر هەر ئەو چـەكو تانكو تۆپەی کەهەی بو لەئیّراندا پیّی فـرۆشت بۆ لەناوبردنی کۆماری مەهابادو رّشـتنی خـویّنی بیّ تاوانان. هەروەها پەیمانیّکـی ئابوریان بەستبو بەسەرمایەی ٣٨٠ ملیون جا لەساڵی ١٣٥٤ ك هە تاوی بەرانبەر ١٩٧٥ ز شـابایی ٣ ملیارد دۆلار، چـەكو شـتومەکی تری لیّکرّی تا دەمکـوتی بکاتو لەسەر کورد هەڵنەداتیّ..

جاخۆت خویّنەری بەریز حـوکم بدە بەسـەر رّەفتـاری ئـەم گورگە ئـادەمیانەدا کەتەنها شیّوەیان لەئینسان ئەچیّ..!!

قاضی محمدلە ١٣٢٦/١/١٠ دا لەمەیدانی چوار چرایشـاری مەهابادا لەسـیّ دارە درا، وە ملا مصطفی کە لەتەك عەشرەتی بەرزانیا هاتبون بۆ پشـتگیری توانی بە ٥٠٠ کەسەوە ئەویش خۆی بگەیەنیّتە رّوسیە. جا خـویّنەری ئـازیز وردبەرەوەو تیّ بینی ئەم هەمو نەگبەتیو نارّەحەتیانە بکـە کەبەسـەر میللەتو گەلی هەژارمانا هیّناویانە..

رّوس ئەبیّ بەدۆستمانو کۆمارمان بۆ دروست ئەکات..! دوای ساڵیّ پشـتمان چۆڵ ئەکات..!!

ئەفسەرانی روس چ کارەبون لەناو سەرۆکایەتی کۆماری مەهابادا؟!

زۆر ئاشکرایه که ئەمانه لەدروستبونی حزبی دیمکراتو اعلان کردنی کۆماری مەهابادو ڕوخـانیشیا دەسـتێکی باڵایان بووه..؟! بەڕاسـتی ئـەمانە هەمو پیلانو ئـاشوبێك بوون که بەرپا کران تائـەم میللەته گری‌و ڕق‌و قینه لەدڵیا دروسـت بێ بەرانبەر گەلی فارسو خوێن بکەوێته بەینەوە..

بەتایبەتی لەسێ داره دانی قـاضی محمدو سـەیفـی برای لەناو مەیدانی چـوار چرادا.. وەلەو شـارەدا کەتا دوێنێ بو سـەرەك کۆماری بوو.. ئـەزانی چـەند کاریگەره؟! چۆن دەماری نەژادپەرستی ئەخروشێنێ؟؟

چۆن وا لەئادەمیزاد ئـەکا کەبەحـەق‌و بەناحـەق میللەتو گەلان لەبەرچـاومان سوك ببێت؟!

کەبەمه ئـەندازەیەکی زۆر لەهەدەفـو ئـامانجی دوژمنانی ئیسـلامو دوژمنانی مرۆڤایەتی هاتەدی..

## بەڵام.. حەیف

هێشتا دوژمنانمان نەناسیوەو هیوامان پێیان ماوەو هەندێ لەلاوەکانمان زوڕنا بۆ ڕوس لێ ئەدەنو گۆرانی بەباڵایا هەڵئەدەن..

جا ئـەوەی شـایانی باسـه که قـاضی محمد لەکۆتایی ژیانیا هەمو پیلانەکانی بۆڕۆشن بۆتەوەو لەزیندانا هەناسەی ساردی هەڵکێشـاوەو فـەرمویەتی: داخـەکەم ئێستا ئەزانم ئەم ڕۆسانه چ پیلانێکیان پێ گێڕام و ئامانجیان چی‌بوو!!.. بەڕاستی بۆم دەرکەوت که ئـامانجی سـەرەکیان له ناوبردی ئیسـلامو بەرپا کردنی خـوێن ڕێژی بوو لەنێوان گەلانی مسڵماندا.. خـوزگه ئیتر لەمه زیاتر گەلی کورد فـریوی نەخواردایه..

## ساڵانی خامۆشی‌و ژێر چەپۆلکی

لەدوای ئـەوەیّ که کۆماری مەهاباد بەشـێوەیەکی دڕندانه لەناوبرا ئیتر گەلی کورد لەلایەن ڕژێمی شاهنشاهیەوە سەرکوت کراوه هەمو حەق‌و مافێکی پێ‌شـێل

بووه، فەرهەنگو خوێندەواریو لباسو جلوبەرگی غەیری خۆی بەسەرا سەپێنراوە، تەنانەت نامەیەکی بەکوردی نوسراو بەیەکێ ببینرایە، ئەبوایە چەند مانگ زیندانیو شکەنجە بدرایە، ئیتر بەم هەمو زوڵمەی کە لێی ئەکرا لەلایەن رژێمی شای سەربە ئەمەریکاو سەهیونیەوە گریەی زۆر لەدڵیدادروستبوونەك بەرانبەر رژێم بەڵکو بەرانبەر گەلی فارسیش.. چونکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو یەکسەری زوڵمەکەی لەلایەنئەوانەوە لێئەکراو دوژمن لەپشتی پەردەوە دیار نەبوو - کاری خۆیشی ئەکرد.

## رضا شاو حەمەی کوڕی

هێنانە سەرکاری رضاشا کەداردەستی ئینگلیز بوو، ئەوەندەی تر بووبە هۆی ڕەواجدان بەحوکمی شایەتیو دیکتاتۆریو زوڵمو ناحەقی لەگەلانی ئێران بەگشتی وە گەلی کورد بەتایبەتی..

جا ئەم ئەڵقە لەگوێیە فەرهەنگو ثقافەتی غەربی بەزۆر سەپان بەسەر خەڵکیداو لباسو جلو بەرگی ئەوروپایی لەبەرکردنو شەبقەی ئەمەریکی (کلاوی پهلوی) لەسەر کردن وەبەناوی ئازادی ژنانەوە ڕەواجی دا بە فەسادو بەداخلاقی، وەبەناوی پێشکەوتنەوە ڕەواجیدا بەقومارو عەرەق. وەاقتصادو ئابوری وڵاتی شکست پێداو فەقیریو هەژاری باڵی ڕەشی کێشا بەسەر وڵاتاندا.

جا کە گۆڕبەگۆڕ بوو حەمەی کوڕی زۆر خراپتر لەو، وە بەزیادەوە بەوکارانە هەستاوە بەڵکو ڕەواجیبە تلیاكو هیرۆینیش داوە.

جائەوەی شایانی باسە کە ئەم شا بۆگەنە، یەکێك بووە لەئەندامە سەرەکیەکانی ڕێکخرواری (سازمان) ماسۆنی کە ڕێکخروایکی سەهیونی جیهانیە..

وەزۆر خراپتر لەباوکی کەوتە زوڵمو زۆر لەگەلانی ئێرانو ڕەواجێکی تەواوی بەهەمو بەدخوییەکدا.. وەبەوەشەوە نەوەستا بەڵکو ڕێکخراوێکی بەناوی (ساواك) بەرپا کرد کەسەربە ڕێکخراوی (CIA) ئەمەریکیبوو لەسەرانسەری ئێراناو کردی بەبنکەی جاسوسی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا. جا ساواك بۆ ئەوەی خوێن ڕێژیو تەفرەقە بەرپا بکات لەنێوان گەلانی مسڵماندا سیاسەتو فێڵی

شـەیتانی زور بوو، بۆنمونە کاتێ کە کەلی بورك نەدەوروبەری تەبرێز کەمێ جەو جولیان تێکەوت سەرۆکی ساواکی ئـەوناوە گەورەکانی کۆکردنەوەو هەڕەشـەی لێکردن بەوەی کە ئەگەر کۆڵ نەدەن بەکوردەکان تەمێتان ئەکەین..!!

بۆئەوەی کەگەلی کوردو تورك چنگیان بچێ بەخوێنی یەکاو ئەمیش سـەیریان بکاو حوکمو فەرمانڕەواییان بەسەرا بسەپێنێ.

وەئـەمانە هەناسـەیان لەهاوڵاتیان بەشـێوەیەك چنی بوو کەهەتا براو برا ژنو مێرد لەبەك ئەمین نەبون. جا ساواکیەکان زۆر بەدڵسـوزانە ـ چـونکە خـزمەتی چا ـان پێ ئەکرا ـ وەکو گورك کەوتنە ناو خـەڵکـیەوە، هەسـتی بچـوكترین شتێ بکـە ... زۆرێم زەرەری هەیە، دەرگای زیندانو شکـەنجـەدانیان ئەخستە سەر پشت.

## تەتگانە بەری کورتە

هەر چـەندە ئێمە لەچـاو تەمەنی کورتمانا بەدرێژی ئـەزانین. بەڵام وائێسـتا بینیمان بەچاوی خۆمان کەچۆن ئەو ڕژێمە سـەرسـەخـتو لەڕواڵەتا مەحکـەمو دامەزراوە بەمشـتی خـاڵی بەڵام بەهۆی یەکێتیو شـعارو دروشـمی اللهاکبر.. و..لاالەالااللەوە سەرەونگوم کرا، وەساواکیو خوێن مژەکان زۆرێکیان بەجەهەنم شادکران!! بەڵام زۆرێکیشان هەڵاتن بۆ کوردستانو لەتەك دەسـتەو گروهەکانی ترا پەیمانی هاوکاریانبەستو لە لایەن روسو ئـەمەریکـاو ئیسـرائیلەوە بەهۆی عێراقو لە رێگـەی بەعثەوە بەهێز کران، وەرادوێی لندنو ئـەمریکـا پشـتیوانی لێکردنو فرمێسکی تیمساحی هەڵئـەوەران بۆ ئـەوانەیان کە اعدام ئـەکران بەتایبەتی هویدای ماسونی. وەئاشکراشبوو کە ئـەمانە زوربەیان فـارسو تورکو بلوچو تورکمەن بون کەبەهۆی سـاواکیبونو کۆمونیسـتی بونیایەوە یەکێتی کەوتبوە نێوانیانو بون بەدڵسوزی گەلی هەژارمان کەتادوێنێ بوو هەرئـەمانە بون زوڵمیان لێئەکرد، بەڵام ئـەمڕۆ بون بەدڵسـوزو دۆسـتیو داوای خـود مختاری بۆ ئەکەن!!؟

جا دیارە ئێستاش هەر ئەیانەوێ کەپیلانی ئاغاکانیان بەردەوام بێ وەئەم جـارە

بەناوێکی ترەوە خوێن ڕێژی بەرپابکەن لەنێوان گەلانی مسڵمانا هەتا ئەوە سەیرە کە بون‌بە (سُنّی) یەکی سەر سەخت‌و فرمێسك ئەرێژن ودفاعی لی‌ئەکەن..!!.

## ئیمپریالیزم‌و کوردستان

لەساڵی ١٩١٩ ز بەرانبەر ١٢٩٨ ك هەتاوی، دوای وەعدەی بلفوری یهودی کەوەزیری دەرەوەی ئینگلیز بوو، بەدروست‌کردنی نیشتمانێك بۆجولەکە زۆرجار ناو ئەبرا لە بەرپا کردنی دەوڵەتی کوردستانی گەورە، جایەکێ لەئامانجیان لەم‌پروپاگندەیە ئەوەبوە کەویستویانە گەلی عەرەبی مسڵمان‌و گەلانی تریش بەدبین بکەن بەرانبەر گەلی کوردو وایان تێبگەیەنن کەجۆرە علاقەو پەیوەندی‌یەکیان هەیە بەیەکەوە.

چونکە لەوەودوا بەتایبەتی لەعێراقدا کە(شۆرش)ێك بەرپا ئەکرا دەها کاربەدەستی عەرەب ئەیانوت: نایەڵین ئیسرائیلی دوهەم بەرپا بێ لەسەرو عێراقدا..

**جاوەنەبێ بۆ لەناو بردنی ئیسرائیلی یەکەم کارێکیان کردبێ..!!**

بەڵکو زوربەی سەرۆك‌و پاشاکانی عەرەب خیانەتیان کرد بەگەلانی مسڵمان‌و گەلی عەرەبیش وە لەژێرەوە بون بەهۆی بەهێزبونی، وەئیسرائیلیش بەشێوەیەکی نایەکسەری‌و غیر مستقیم دەستێکی باڵای هەبو لەهەمو ئاشوب‌و خوێن ڕێژی‌یەکدا کەلەکوردستانا بەرپا ئەبوو..

جا دروست‌بونی دەوڵەتی کوردستانی گەورە لەبەر چاوی کاڵی گەلی کورد نیە، بەڵکو دوژمنانی ئیسلام بەگاورو جولەکەو خوانەناسانەوە ئامانجیان لەناو بردنی ئیسلام‌و تەفرەقە نانەوەیە، وەمەسەلەی نەژادیان کردوە بەوەسیلەو هۆیەك بۆئەوەی کەبەئامانجی چەپەڵی خۆیان بگەن..

جا لەکۆنفراسە نهێنی‌یەکانیانا نەخشەیان کێشاوە کەلەهەشتاکانا کارێ بکەن بۆبەرپا بونی، یەعنی لەساڵی ١٩٨٠-١٩٩٠ ز بەرانبەر ١٣٥٩-١٣٦٩ ك‌هەتاوی وەبە پێویستیان زانیوە تائەوپەڕی خوێن ڕێژی‌و جەنگ بەرپا نەبێ ئەوکارە نەکەن..

جا نازانین ئایا ئێستاش لەسەر ئەوبڕیارە ماون یان نا.. بەهەر حاڵ لەو[illegible]دا کەجەنگ لەکوردستانی عێراقدا بەردەوامبوو، جار جار ڕادیوی‌ی ئیسرائیل باسی ئەکرد..!!

بەڵام ئێستا ڕادوی‌ لندن‌و دەنگی ئەمەریکاو عێراقیش بەگەرمی لەبزوتنەوەی شێ‌عزالدین‌و قاسملو ئەدوێن.. تۆ بڵێ‌ی سەرەتای بەرپا کردنی پیلانێکی گەورە نەبێ..؟!!

## دڵسۆزان سەریان هەڵدایەوە

نۆکەرانی ئیمپریالیزم دوای سەرنگوم کردنی رژێمی شایەتی سەریان هەڵدایەوەو دەست لەناو دەست لەتەك ساواکی‌و کۆمۆنیستەکانا دیسانەوە کوردستانیان کرد بەجێ‌ی پیلان‌و ئاژاوەو کەوتنە زوڕنا لێدان.

جا سەرانی ئەو تاقمە چەکدارانە هەیانە لەساواکی‌یە دڵسۆزەکانە..!! هەشیانە لە ڕێگەی تورکیەوە پەیوەندیەکی بتەویان هەبوەو هەیانە لەتەك سوپاگای ڕۆژئاوادا، جا ئەمانە لەلایەن هاوکارانی زوویانەوە کە خۆیان بەپێشکەوتو ئەزانن تاوانبار کراون بەوەی کە یارمەتی ئاشکرا دراون لەلایەن ناتووە..

جا ئەمانە لەلێ‌پرسینەوە گشتی‌یەکەدا بەشداریان نەکرد.. وەلەدەرەوەی سنورەوە هاندران بۆ بیانو گرتن.

جا ئەمانە بۆ ئەوەی چاو بەستیەکی زیاتر لەخەڵکی بکەن جۆرە نامەو بلاوکراوەیەك ئەخەنە ڕو کە بەفێڵ هێرش ئەکاتە سەر دۆستەکانیان..!!

بەڕاستی پیلانی دوژمنان زۆر شەیتانانەیە لایەنگرانی ئەمەریکا لەژێرەوە بۆ چاووڕاو هێرشی بەقسە ئەکەنە سەر.. وەهەروەها جابەم کارەیان ئەوەندەی تر خەڵکی سادە بەدبەخت ئەکەن..

جائەبوایە دڵسۆزانی گەلی‌کورد..! کە بە گەرمی‌هاموشۆی بعثی غەمخوار ئەکەن سەیرێکی دێهاتە کاولەکانیان بکردایەو لە هۆی وێرانی پرسیاریان بکردایە لە مێشێل‌و صدام..!!

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران نۆکەران فەرمانیان پی‌درا دەست بەکار بن‌و

بچن بۆ ڕزگـار کردنی کوردستانی ئێران..!! نەوەکو ئەمە ڕاستیی‌و کۆنە پەرستی سەری هەڵدا بێتەوە..!!

جا لە سەرە تای شۆڕشەکەدا توانیان چـەندەها سـەربازخـانە تاڵان بکـەن‌و چەکێکی زۆر بە دەست بێنن، وە ئەمەش وە نەبێ لە ئازایەتیان بێ بەڵکـو خیانەتی شاپەرستو ساواکی‌و ئەڵقەلە گوێ کانی ناو سوپا ئەو کارەی بۆ ئاسان کردن. ئیتر لە هەمو لایەك دەست بەکار بوون‌و کەوتنە ئاشوب گێڕان‌و گەورەترین خوێن ڕێژی‌یان لە نەغەدە بەرپا کرد لەنێوان گەلی کوردو تورکدا لەو شـارە بچـوکەدا وەکو توڵە سەند نەوەیەك..

وە بەم کارەیان دەماری نەژاد پەرسـتیان لە هەردو نەتەوەکەدا خـرۆشان‌و نەخشەی ئاغاکانیان فـەراهەم هات کە وەکو ووتمان نانەوەی تەفـرەقـەو خـوێن ڕێژی‌یە لە نیوان گەلانی مسڵماندا..

جا ئـەمانە دوژمنایەتی خـۆیانیان بە تەواوی لە تەك ئیسـلامدا ئـاشکرا کرد.. بەتایبەتی لەو ماوەیەدا کە دەستیان ئەڕۆی بەسەر هەندێ شـوێنی کوردسـتاندا ـ وەئێستاش لە هەر شوێنێ فرسەت بێنن ـ دەها بەڵکو سەدەها لە لاوانیان بەتاوانی مسڵمان بوون بەدڕندانە لە ژێر ئـازارو شکـەنجـەدا بە پلەو پایەی شـەهادەت گەیاندووە.. ئیتر مسـڵمانیەتی ـ بەهەمومەعنای‌ووشـەکە ـ قـاچاخ بوو لە کوردستاندا.

## بە نۆرەیە

جا دوای ئـەوەی لەماوەیەکی کەمدا زوربەی ناوچـەکان پاکسـازی کراو ئـەو مسڵمانانەی کە کۆچیان کردبو گەرانەوە، لەلایەن خەڵکی مسڵمانی بە شەرەفـەوە پێشوازی‌یەکی گەرمیان لی‌کرا.

مسـڵمانەکانیش زۆر خـۆش‌بین‌و دڵپاك بون‌وگەیاندیان بە خـەڵکـی کە لە ژێر سایەی کۆماری ئیسلامیدا حەقـی تاکە کەسـێك نافـەوتێ چجـای میللەتێك، وە کاربەدەستانیش زۆرجار ئەمەیان بە ـ گوفتار ـ گەیاند بوو..

بەڵام ڕۆژگار هات‌و ڕۆی هیچێك لەو وەعدەو بەڵێنانە نەهاتەدی. ئیتر دەمی

دوژمنان بەرەڵا بوو کەوتنە پروپاگندە دژی ڕژێمو مسڵمانان. هەروەها مسڵمانانیش دلساردی روی تی‌کردن.

ئـەوسـا دوژمنان بە هێزبونەوەو دەسـەڵاتیان پەیدا کردەوە، بە تایبەتی چـونکە پشتیان قـایم بوو بە هۆی یارمەتی بەردەوامی روس‌و ئـەمەریکـاو ئیسـرائیلەوە، تـوانیـان خەڵکی هەزارو داماو بخەڵەتێنن، وەخۆیان بخـەنە پێسـتی‌مەڕەوە. ئیتر مسڵمانان ناچاری هجـرەت‌و کۆچ‌کردن بونەوە، ئـەڵبەتە نەك لەترسـا، چـونکە مسڵمان لە مردن ناترسی‌و ئەو پەڕی ئاواتی شـەهید بوونە لە پێناوی‌خـوادا، بەڵام ئەو ئاوا تەش وەختوکاتی خۆی هەیە..

ئەوسا خـوانەناسـان گەڕانەوە کە گەلێکیان مافیان بە کـوردو کـوردایەتی‌یەوە نەبوو، وە ڕژانە ناو شارو دێهاتەکانی کوردسـتانی غەمبار. وە بە داخـەوە ئـەڵێین کە زۆر خەڵکـی سـادەیان هەڵخـەڵەتان بە درۆو دەلەسـەو پەیڕەوی‌کردن لە گوفتارە نامبارەکە کە ئەڵێت:

درۆبکەوئەوەندە لەسەری‌بچۆودوبارەی بکەرەوەتائەوخەڵکەبەراستی‌ئەزانن.

## زۆرداران زۆریان هێنا

عێراق بە تەواوی دەستی کێشا بوە ناوچـەی کوردسـتانەوە، وە ئـەفسـەرو سیخوڕان بە ئازادی هاموشـۆیان ئـەکرد، بگـرە بهـاءالدین نوری کەلەوەو پێش باسمان‌کرد چەندجار سەری لە مەهاباد داوەو لەتەك ئـەوانەی کە خـۆیان‌کردوە بە گەورە کۆبونەوەی بووە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە جـاسوس‌و سـیخوڕانی ئەمەریکی‌و روسی‌و ئینگلیزی‌و فەرەنسـی‌و.. و.. کەبە ناوی رۆژنامەنو سـەوە بون لەکوردستان‌دا بە چـالاکی لەهەوڵدابوون بۆ نەخشـە کێشـان‌و بەرپا کردنی پیلانی جۆر بەجۆر.

## نمونەی ڕەفتاریان

لەوچەند مانگەی کە دوژمنانی خـواو مرۆڤـایەتی دەسـەڵاتیان بوو ئـەوەی

کەکردیان بەقـــەڵەم نانوســـریێو بەدەم ناگێڕێتەوە، توانیان ڕۆی هۆلاکۆو جنگیزخانو ڕەزاشاو ساوکو ستالین سپی بکەن..

وەرەواج بدەن بەعەرەقو قومارو داوێن پیسیو هەمو خراپکاری‌یەك..

جاقسەیەت قسەئـەبڕێ لەمدواییەدا کەناوچـەکە پاکسـازی کرا لەبنکـەپیسو تەویلەکانیانا جۆرەها عەرەق بەدەست هاتبو لەتەك جۆرەها حـەبو وەسـائلی دژی بەرگری لەمناڵبون... ئاخر دەرمانخانە نەبیتو ئەوە حاڵت بێ...!!

ئیتر بکـوژو ببڕ خـۆیان بونو هەناسـەیان لەو مسـڵمانانە چنی کە مابونەوە، وە هەرکەسێ نوێژی بخوێندایەو لاالەالااللەو اللەاکبری بوتایە بە... ئەدرا قەڵەم

وە هەرکە سێکیان هەست بکردایە کە جەو جولێکی ئیسلامی هەیە بێ سـەرو شوێن ئەیانبرد وە لەوانە چەند لاوێکی چواردەو پانزەساڵە کەئـەخـرانە ژێر ئـازارو شکەنجەی جـۆر بەجـۆرەوە، وەکو لێدان بەلیسو قـۆناغە تفـەنگ، ڕاگرتنبەپێوە بۆماوەیەکی زۆر، زیندان کردنیان لەشوێنی ساردو شـێدارا، توێ کردنی کۆشـتی ڕانو باڵیان وە خوێ تێ کردنو بەستنی...

ئیتر دەوڵەت ناچار بوو کەلەسنەدا بەرەنگاریان ببێ..

وەتوانی لەماوەی چەند حەفتەیەکدا شار ڕزگار بکا هەرچەندە چاك خۆیان قـایم کردبو، وەزوربەی بانە بەرزەکانو خیابانو شەقامەکانیان کردبو بەسەنگـەر، دوای ئەوەی هەندێکیان لێکوژراو بون بەهۆی شەهید بونی خەڵکێکی زۆری بێ تاوان، چـونکە گەلێکیان لەماڵانو لەپشـتی ماڵو منالەوە سـەنگـەریان گرتبو، هەڵاتن بۆ جێگاکانی‌تر وەهەندێکیان تاسلێمانیو بەغا نەوەستان.

ئەوەشـمان بیرنەچـێ کەبریندارەکانیان هەرزوو لەنەخـۆشخانەکانی سـلێمانیو کەر کوكو بەغادا چارەسەر ئەکران..

زۆر سەیرە ئەبێ بەعث ئامانجی چی بێ لەخزمەت کردن بەمانە؟! برایانی ئازیز هۆشتان پیابێنەوەو دوژمنان بناسن!!

## لەبنکەکانیانا چی دەستکەوت

گەلێك نامەو نوسراوی نهێنیو مەحرەمانە بەدەست هات کەیەکێکیان فەرمانێك

بوو کەپێیان درابو لەلایەن ئـاغاکانیانەوە لەدەرەوەی وولات کە بەهیچ شـێوەو نرخێك شـاری سـنە لەدەسـت نەدەن، لەنامەیەکی تردا نوسـرابو کە گەورەترین دوژمنانمان مسلمانەکانن کە پێوستە لەناوبرێن.
هەروەها چـەندەها نامەی تر بەدەسـت هات کە بەئـاشکرا پەیوەندی ئـەمانە لەتەك رژێمی بەعثو ئەمەریکاو روسو بگرە ئیسرائیلیش‌دا ئاشکرا ئەکات.

## رەفتاری بەکرێ گیراوانو ئەلقە لەگوێکان

لەوچەند رۆژەی کەمزۆریان بۆهاتبو، وەشکسـتیو سـەر شـۆڕی چـاوەڕێی ئـەکردن، کەوتنە برۆبیانو لەمسـلمانانی ژێر دەسـتەو گەلێکیان زیندان کردنو کەوتنە شکەنجەدانیان وەبە شێوەیەکی درندانە زۆریان لێ شەهید کردن..
بەتایبەتی خێزانو خـانە وادەی شـبلی کە گەورەترین بەڵاو مصـیبەتیان بەسەراهاتو سێ لاوی خـواناسو ئیمانداریان لەدەسـتدا، جـا دایکیشـیان بە سوێی ئەوانەوە سەری نایەوە، هاوار ئەکات لە قاپی پەروەردگار کە حەقـی کوڕە بێ تاوانەکانی بسێنێ.. هەروەها هاوار ئـەکا لە گەلی هەژارو بەدبەختمان کە ئیتر بەسەو لەمە زیاتر فریوی دوژمنانی خواو پێغەمبەری خوا مەخۆن.
هەروەها ئەم مجرمو تاوانبارانە توانیان سیان لەکوڕانی نمەکی بگرنو بەتاوانی ئیسلام بون هەرسێکیان شەهید بکەن کەبچوکەکەیان تەمەنی لە ١٥ سالّ کەمتر بوو..
وەباو کیانو خوشکەکەشیان بەسەختی بریندار کرد.. بەو شێوەیە زیاد لە ١٦٠ مسلمانی بێتاوان شەهید کران، وەتەنها تاوانیان مسـلمان بون بوو، چـونکە ئـەم ئەلقە لەگوێیانە، ئیسلامو مسـلمانانی واقعـیو ڕاستـەقینە بەگەورەترین دوژمنو کۆسپ ئەزانن..
جا ئەم درندانە هەندێ کەسیان کە ئەگرت دوای ئـازارو شکـەنجـەو قسـەی ناشیرینی زۆر، گۆڕیان پێ هەڵئەکەندو لەلێوارەکەیا ڕایان ئـەگرتو گوللە بارانیان ئەکرد، ئیتر ئەکەوتە چاڵەکەوەو گیانی تیابمایە یانەمایە دایان ئەپۆشی کە هولاکۆ کاری وای نەکردبو..

وەجەنازەی هەندێکیان سوتاندو دەستو قاچی زۆریشیان بڕیبوو..

هەروەها گەلێ لەجەنازەو تەرمەکانیان نەناشتبو، بەڵکو هەروا لەودوڵو شیوانەدا فڕێیان‌دابو کەزوربەیان بوبون بەخۆراکی قەل‌ودال..

جا ئەمەی لەسنەدا بەمسڵمانیان کرد لەمەهابادو مەریوان‌و سەقزو بانەو هەمو شارو دێهاتەکانی کوردستاندا کردیان، بۆنمونە کاتێ کەدەسەڵاتیان بەسەرپاوەدا نەبو بەتۆپەکانی دەوڵەتی بەعث تۆپ بارانی ئەم شارەیان کرد، هەر وەکو مەسەلە کوردی‌یەکە ئەڵێ (شەل‌و کویرم ناپارێزم) دەها کەسی بێ‌تاوان لەژن‌و منال‌و پیرەمێرد پێوە بون..

وە کە دەسەڵاتی تۆپبارانیان نەما کەوتنە دانانی مین لەسەر ڕێگای ئوتومبیل‌دا وەزۆریان تەقینەوە لەژێر مینی‌بووس‌دا کەپڕبوو لەخەڵکی هەژارو داماوی کورد کە بەحساب ئەمانە ئەیانەوێ (خود موختاری) بۆبسێنن..!! جا براو خوشکی ئازیز ئەگەر تەنها کاری خراپی ئەمان هەر ئەمە بوایە بەس بوو بۆ کەسانی هۆشمەند کەتێ بگەن ئەمانە داردەستو ئەڵقە لەگوێن‌و هدف‌و ئامانجی سەرەکیان خوێن ڕێژی‌و تاوان کردنە بەناوی جۆر بەجۆرەوە.. وەخەڵکێکی سادەو نائاگایان هەڵخەڵە تاندووە.

## بۆچی مسڵمانان لاوازبون‌و ناچاری هجرەت بوون

زۆرکەس وا ئەزانێ کە لاواز کردنی مسڵمانان پیلانێك بوو کە ئەمە تارادەیەك ڕاستە، بەڵام لەهەمان کاتا امتحان‌و تاقی‌کردنەوەیەکی گەورە بو کە خوای گەورە ویستی چاك‌و خراپ وەمسڵمان‌و نامسڵمان لەیەك جیابکاتەوە، کە بەو شێوەیە ناچاری هجرەتو کۆچ کردن بون‌و هەمو مصلحەتو بەرژەوەندەیەکی خۆیان نایە کەنار، وە بۆ زۆر کەس‌و بۆ خۆشیان دەرکەوت کەبایی چەندن‌و تاچ ئەندازەیەك ئەتوانن لەتەك بەرنامەی خوادا بن‌و فیداکارو پاسەوانی بن..

ئەمە لەلایەك، بەڵام لەلایەکی تریشەوە مسڵمانان دوو کەمو کوڕی گەورەیان تیا بوو، کەیەکێکیان نەبونی نەزمێکی ڕێكو پێك لەکارو هەڵسوکەوتیانا، کەدوژمنانی ئیسلام تەنها بەوە توانیویانە پێشرەفت بکەن.

دوهەمیان: سستی و تەمەڵی لەڕوی عبادەتو پەرستشەوە وەلاوازی تەقواو پارێزکاری لەناو مسڵماناندا، کە ئەم بەرنامەیە هیچ حزبو گروهێکی دنیایی نیەتی، وەشتێکی ئەساسیو بنەڕەتیشە لەبەرنامەی خوادا، وەبەمە مسڵمانان توانیویانە کاتی خوی ئیمپراتوریەتی رۆمو عەجەم نەهێڵن، وەئێستاش پێویستە هەمان رەوی‌یە پەیرەوی لێوە بکرێ..

جا هیوادارین بەپشتیوانی پەروەردگاری مەزن کەزاڵ بنو زاڵ بوبن بەسەر هەردو کوسپەکەدا وە دەرسو پەندو ئاموژگاریان وەرگرتبێ..

جاله هەموی خەتەر ترو سامناك‌تر ئەوەیە کە لەوە ئەچێ ئیستعمار زۆر بە گەرمی خەریکی هەڵگیرساندنی جەنگێکی مەزهەبی‌یە بە هەمو هوو وەسیلەیەك، وە ئەم وەزعەی ئێستا بە چاکترین فرسەت ئەزانێ بو ئەو مەبەستە وەسەوو روژ لەبیری ئەوەدان کە چی‌بکەن بو بەرپا کردنی.

وە بەم کارەیان ـ کە بەپشتیوانی خوا بویان ناچێتە سەر ئەوەندەی تر خەڵکی نائاگا بەدبین ئەکەن بەرانبەر ئیسلام.

جا پێویستە دڵسوزان هوشیاربن غەمخواران بێداربن لەپیلانو فێڵی‌دوژمنانی خواو مروڤایەتی.

## لەسوریەدا

لەسوریەدا نزیکەی نیوملێون مسڵمانی کورد هەیە کە ئەوانیش بەهوی هەمان سیاسەتی ئیمپریالیزمی یەوە کە ئەندازەیەك لی‌ی دواین، بەش خوراوو زوڵم لێ‌کراون بەتایبەتی لەم ساڵانەی دوایی‌دا کەلەوێش بعثی‌یە چەپی‌یەکان (نصیریە)کان کاروباریووڵاتیان گرتوتە دەست، جائەوانە وە نەبێ تەنها زوڵمیان لە گەلی کورد کردبێ، بەڵکو زوڵمو ستەمیان لە گەلی عەرەب زیاترە بەتایبەتی لەم دوایی‌یەدا کە زۆر بەدڕاندانە کە وتونەتە کوشتو کوشتاری مسڵمانەکانو فەرمانیان داوە کە ئەوەی گومانی لێ‌کرا لە رێکخراوێکی ئیسلامیدایە بە بێ محاکمە لەسەر شەقامو خیاباندا تیرباران بکرێ.

لەیەکێ‌لەزیندانەکانانزیکەی ١٨٠٠ کەسیان بەتاوانی مسڵمانیەتی شەهید کرد.

وه دووقاتو سێ‌قـاتی ئـهو ژمارهیان تائێسـتا به پلهو پایهی شـههادهت گهیاندووه، وهتائێستا که ئهم نامیلکهیه لهژێر چـاپدایه زولمو سـتهمهکه بهردهوامه جاهەروەکو عادهتی دوژمنان ئهو مسلمانه پاك و بێ‌گەردانه که وابهستهی خوانهبێ وابهستهی کهسی‌ترنین وه دوژمنی ئاشکرای ئهمریکاو اسـرائیلن، بهوابهسـتهی ئهمریکاو اسرائیل ئهدرێنه قهلهم ، بهڵام حهق‌و راستهقینه ههر روشن ئـهبێتهوەو دنیا ههروا شهو نابێ جائیتر داردهستهی مێشێل ناپرسن ئـهمانه کوردن یاعهرهب، به لکو ههر بهمهی که بونی مسـلمانێکی واقعیـو ئیسـلامێکی راسـتهقینه لهههر کهس بێ، ئیتر بهسه بو ئازارو شکهنجهو زیندان‌و شههید بون.

جا زورێك لهو برامسلمانه کوردانهمان شـان بهشـانی برایانی مسـلمانی عهرهب ئێستالهو پهرێ تهنگانهدان وه هاوار ئـهکهن له مسـلمانان ههرکێ ههن وه لهههر کوێ ههن کهفریامان کهون، یاهیچ نهبێ لهدوعای خێر بێ بهشمان مهکهن.

## لهروسیهدا

له ژێر سـایهی رژێمی کومونیسـتی‌و دکتاتوریهتی بهسـهر پرولیتاریادا!! مافـی ههموو نهتهوهیهك پێ شـێل کراوه به تایبهتی گهلی کورد کهبێ پشـتیوانه ئیتر به زورو به فێل، وهبههوێ بهرنامهی پهروهرشـی تایبهتی‌یهوه ههندێکیان ههڵخـهله تاندوه و ههناسهیان لهوانی تر چنیوه.

دین وه بهتایبهتی ئاینی پیروزی ئیسـلام لهوێ قـاچاخهو زوربهی مزگهوتانیان داخسـتوهو کردویانن به بنکـه بو حـزب، وهههتا بگـره لهههندێ لهمزگهوته خوشهکانیان کردووه به جێگهی رابواردن‌و کاری نامهشروع.

وه چهند دانهیهکی تایبهتیان بو چاوبهست هێشتوتهوه تائـهگهر کهسـێ چـوو بو ئهوێ ههلی خهڵهتێنن‌و بڵێن ئازادی ههیه..!!

## خوا لهسلطان محمود گهوره تره!

بهڵێ لهڕاستی‌دا خـوا لهسـلطان محمود گهورهتره،شهرت نیه ههرچـی پیلان‌و

فێڵیان هەیە سەربگرێ، وەتا ئێستا هەرچی پیلانو فێڵیان [illegible] سەری گرتوە بەهۆی نائاگاهیو بێخەبەری گەلانی مسڵمانەوە بووە..

بەڵام ئێستا لەسایەی ڕەحمی خواوە لەهەمولایەك گەلانی مسڵمان خەریكن بێدار ئەبنەوەو دوژمنان ئەناسنو پەی ئەبەن بەپیلانو فێڵیان..

بەڵام بەداخەوە ئەتوانین بڵێین كە گەلی كوردمان ئێستا واتازە لەسەرەتای بێداربونەوەدایە..

جا لەناخی دڵمانەوە داوا كارین لەدڵسۆزانو ڕاستگۆیانو دۆستانو خێرخواهان كەئێستا ئیتر كاتی ئەوە هاتوە كەبێدار بینەوەو دوژمنانمان بناسین، وەتكاكارین لەخۆشەویستو ئازیزانمان كەباتازووەو فرسەتەكە لەدەستاماوە هەوڵێ بدەین كەدەوڵەتی ئیسلام لە دڵەكانمانا وەلەڕەفتارمانا وەلەناوخاوو خێزانمانا بەرپا بكەین تابەكۆمەكی خوا بتوانین دەوڵەتی ئیسلامی جیهانی بەرپا بكەین وەكوردستانی ئازیز بكەینە وولایەتێكو ناوچەیەكی.

جائەوسا ئەبینی كەچ خۆشیو سەعادەتو كامەرانیەك لەژێر ئاڵای ئیسلامو بەرنامەی خوادا ڕۆئەكاتە هەموانو هەمو زوڵمو ستەمێك بە پشتیوانی خوا لەبەین ئەچێ..

پێویستە هەوڵی زیندانی كردنی خۆمان لەناو كوردستانێكی نەژادپەرستا كەخوانەناسان حاكمو گەورەمان بن بنێینەكەنار، چونكە نەوەی ئادەمیزاد هەموی برایەكەو جیاوازی نەژاد ئەبێ ببێ بەمایەی برایەتیو خۆشەویستیو یارمەتی نەك نەفرەتو تەفرەقەو خوێنڕێژی كەدوژمنانی خوا ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بەفەرمانی ئاغاكانیان كەسەهیونی جیهانیو ماسۆنیە ئەیانەوێ بەرپای بكەن لەنێوانمانا لەبەر مصلحەتو بەرژەوەندی پیسو بۆگەنی خۆیان.. قورئان ئەفەرموێ:

**(یاایها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم..**

واتە: ئەی خەڵكینە ئێوەمان دروست كردوەو خەلقمان كردون لەنێرومێیەك (ئادەمو حەوا) وەكردومانن بەگەلانو هۆزان بۆ تەعارفو محبەتو خۆشەویستیو ئاشنایی.. وەچاكترینو بەڕێزترینتان لایخوا باتەقواترینو خواناسترینتانە..

جا ئێمه کەهەمووبەندەو عەبدی خواین حـەیف نیە لەسـەر ئـەوەی کەشـیوەی لیاس یاقسـەو گفتوگۆمان جیاوازە لەتەك گەلانی ترا، ئـەمه بکـەین بەمایەی تەفرەقەو دوبەرەکی، نا بەڵکو ئازیزان پێویسـتە برایەتیو خـۆشەویسـتی لەسـەر ئەساسو بناغەی خواشناسی بەرپا بکەین لەتەك هەموانا بەپشتیوانی خوای گەورە هەروەها پێویستە مسـڵمانان سـادەو خـۆش بڕوا نەبن چـونکە فێڵو تەڵەکەو دوژمنانی زۆر هەیە کەهەمیشـە لەکەمیندانو زۆر نزیکـە هەر بەناوی دینەوە بەرهەڵستیمان بکەنو داومان بۆ بنێنەوە..

## لەکۆتاییدا

خوێنەری ئازیز لەم گەشتە خێرایەدا کە کردمان بە کوردستانی تورکیاو عێراقو ئێراندا تائەندازەیەك بۆمان دەرکەوت کە چ پیلانو نەخشـەیەك لەئـارادایە بەناوی جۆر بەجۆرەوە، کەهەدەف تەنهـا تەفـرەقـە نانەوەو بەرپا کردنی خـوێن ڕێژییە لەناو گەلانی مسڵماندا، وە گەلی کورد کراوە بەداردەسـتێکی چـاك بۆ جـێ بەجـێ کردنی پیلانەکانی ڕوسو ئەمەریکاو ئیسرائیل، جا زۆر کەس لەوانەیە بفـەرموێ: ئیسرائیل ئەو دەوڵەتە بچوکە چی لەدەست دێو ئەتوانێ چی بکات.؟

نا وانیە ئەوئیسرائیلە بچوکەی تۆ ئەیبینی ئەو ئەمریکا زلە لەژێر چـەپۆکی ئـەو دایە، چونکە جولەکەو یهـود اقتصـادو ئـابوریووڵاتیان بەتەوای گرتوتە دەسـت خاوەنی هەمو کارخانەکانی ئوتومبیل سازیو فـڕۆکە سـازیو هەمو جـۆرە چـەك سازیەکن. وەبگرە ڕوسیش هەر ژێر چـەپۆکی ئـەوانە، لەسـاڵی ١٩٦٧ ز بەرانبەر ١٣٤٦ ك هەتاوی کە جـەنگ لەنێوان ئیسـرائیلو عەرەبەکانا دەسـتی پێکرد ئەمەریکا چەکێکـی زۆری دایە، بەڵام روس بەناوی دەرکردنەوە!! شـەسـت هەزار فـڕۆکەوانو شـوفیری تانکو تۆپـچـی دایە، لەولاوە ئیسـرائیلی پێ بەهێز کرد لەولاشەوە خۆی بەدڵسـۆزی عەرەبەکان نیشـاندا کە گوایە ئـەوەندە لایەنگـریانە ئەوەتە جولەکەو یهود لەوڵاتەکەیدا دەرئەکات..!!

جا خوێنەری هوشیار دوژمنانی خـواو ئینسـانیەت ئـامانجی سـەرەکیان هاتوتە سەرئەوەی کە ئیسلام بەهەمو وەسیلەو هۆیەك لەناو ببەن..

دەمێ ڕەواجی کۆمونیستی ئەدەن..
دەمێکی تر ڕەواجی نەژاد پەرستی ئەدەن..
دوای ماوەیەکی تر ڕەواجی سۆسیالیسم ئەدەن ماوەیەکی تر دەهۆڵو زوڕنا بۆدیمکراسی لێ ئەدەن..
وە لێپرسراو وکاربەدەستانی ئەم هەمو دەستەو گروهانەی کە لەناومانا دروست کراوە یا سەربە ڕۆژهەڵاتو ڕوسن، یا سەربە ڕۆژ ئاواو ئەمەریکان، کەوەکو ووتمان ئەمانیش ژێر چەپۆکی ئیسرائیلن..
وەبگرە زۆر جار ڕەواج بەجۆرە دینو کەسانێکیش ئەدەن وئەم بەرو ئەوبەری پێ ئەکەنو خەڵکی هەژاری پێ ئەخەڵەتێننو بەرەنگاری ئیسلامی ڕاستەقینەی پێ ئەکەن..
جا هەرچی دامو دەزگا هەیەڕنە رادیووتلویزیۆنەوە بیگرە تا ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب هەموی خراوەتەکار تابە شێوەیەکی مستقیمو یەکسەری یا غیر مستقیم تا بەرەنگاری ئیسلامی پێبکەنو خەڵکی بەدبین بکەن بەرانبەری..
وە ئەم دوژمنانە کەرو کوێرن بەرانبەر هەمو ڕوداوێك کە سوزی ئیسلامی لەدڵی مسڵمانا بخرۆشێنێ، جا یاهەر باسی ناکەن یا ڕوداوەکان هەڵئەگێڕنەوەو مسڵمانانی تێکۆشەرو مجاهد ناشیرین ئەکەن..
بەڵام دوژمنانی خوا خەیاڵیان خاوەو ڕەنجیان خەسارە لەڕووڕەشی دنیاو ئاخرەت زیاتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە ـ چونکە خوای گەورە دینی خۆی هەر سەر ئەخات بەرنامەی خۆی هەر پیروز ئەکات سەربازانی خۆی غاڵبو بەهێزو سەرکەوتو ئەکات هەروەکو ئەفەرموێ:
**ولقد سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلين، انهم لهم المنصورون وان جندنا لهم الغالبون..**
یەعنی بەڕاستی بڕیارمان داوە بەبەندە پێغەمبەرەکانمان کە بەتحقیق سەرکەوتوو پیروزن، وەسەربازەکانیشمان کەغاڵبو سەرکەوتون..
جازوکە خوێنەری ئازیز بجۆرە ڕێزی سەربازانی خواوەو خۆت بفرۆشە بەخوا قەت زەرەر ناکەیتو بۆ هەمیشە قازانجت کردووە، چونکە سەربازانی خوا ئەگەر لەپێناوی خوادا وەلەڕێگای هەڵکردنی ئاڵای خوادا شەهید کران ئەوە ئەوپەڕی

ئاواتیان هاتوّته دی، وەئەگەر سەرکەوتن‌و پیروّزیشیان بەدەست هێنا ئەوە نعمەت‌و پاداشتێکی تری خوایی‌یەو ئەبێ شوکرانە بژێری بن‌و سوپاسی بکەن..

جا هەریەکێ لەئێمە خاوەنی یەك‌دانە ڕوّح‌و گیانە، ئەگەر نەیبەخشین بەخوا بەبێ نرخ لەدەستمان دەرئەچێ، جا چاکتروایە کەتازەوو فرسەتەکە لەدەستا ماوە خوّمان‌و ماڵ‌و سامانمان ببەخشین بەخوا، چونکە ئەو دەمێکە بەهەشتی بوّ ئامادە کردوین..

جا پێویستە گەلی مسلّمانی کوردی ئازیزمان بێدار بێتەوەو لەمەزیاتر فریو نەخواو نەیەڵێ کڵاوی بچێتە سەر، نەشا دوّستی بوو کەئەو هەمو زوڵم‌و ستەمەی لەگەلی هەژارمان کرد لە ئێران‌و عێراقدا، وەنەصدام‌و نمونەی صدام‌و امثالی صدام دوّستێتی بەڵکو ئەمانە هەمودەم دوژمنی سەرسەختمان بون. نەروس‌و سوپاگای ڕوّژهەڵات‌و دکتاتوّریەتی پروّلیتاریا دوّستمانە کەبەگوفتەی ببرك کارمل کەکردویانە بەسەروّکی ئەفغانستان ئەم ئاشتی خوازانە! تا ئێستا نزیکەی یەك ملیون مسلّمانانی هەژارو داماو لە ژن‌و منال‌و پیرەمێرد شەهید کردوەو روس بە هەمو هێزەوە هێرشی کردوّتە سەریان‌و زیاد لەملیونێکی لێ ئاوارە کردون، کەچی لەو لایشەوە بێ شەرمانە دروّو دەلەسە ڕێك ئەخەن‌کە گوایە ئەو سەدەها هەزار مجاهدو تێکوّشەرانە کەبەرەنگاری لەشکری ڕوس بون سەرمایەدارن..!!

هەروەها ئەمەریکاو ڕوّژ ئاوای سەرمایەدارو خوێن ڕێژیش هیچ کاتێ نابێ بەدوّست‌و غەم خوارمان، مەگەر هەر ئەمانە نەبون لەدەها شوێنی سەرزەوی‌دا وەکو ڤیتنام‌و کامبوج ساڵەها خوێن ڕێژیان کرد، وەلەجەنگی جیهانی دوهەمدا بە بوّمبی ئەتوّمی دوو شاری گەورە، هیروّشیماو ناگازاکی‌یان لەژاپن‌تەخت‌کرد. باشە هیچ هوّشمەندێك ئەوە ئەسەلمێنێ ئەو گورگانەی دوێنێ ئەمروّ بو بن بەمەڕو قازانج‌و خێریان بوّ ئێمە بوی؟!! خوێنەری دڵسوز، ئەمانە هەمو ئاوات‌و ئامانج‌و هەوڵ‌و تێکوّشانیان بوّ خوّسەپاندنە بەسەر گەلانی مسلّمانی هەژاردا، بەتایبەتی کوردستانی ئێمەش شوێنێکی جوگرافی گرنگی هەیە، لەبەر ئەوە پیلانیان بەردەوامە گروّهو تاقمی کوّمونیستی دروست ئەکەن کە بەحساب سەربەروسە کەچی لەژێرەوە سەربە ئەمەریکایە، وەسەرانی ئەو تاقمو حزبانە نەبێ دارو دەستەی نائاگاهیان نازانن مەسەلە چیە!!، جا هەروەکو ووتمان ئامانجی سەرەکی

ئیمپریالیزمی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، روسو ئەمەریکا لەبەین بردنی ئیسلامە، وەبە گەورەترین دوژمنی ئەزانن بەبێ ئەوەی ناوێکی لێوە ببەن، وە چاکترین رێگەیان دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بەئامانجی چەپەڵیان بگەن لەلایەکەوە خێرو خێراتی وڵاتانی ئیسلام بەرن لەلایەکی ترەوە هەروەها بیکەن بەبازارێك بۆ فرۆشتنی چەكو سلاحو كەلو پەلیان. وەئەمانە بۆ گەیشتن بەئارەزوی چەپەڵی خۆیان باكیان نیە لەوەی ملیونەها بكوژرێ هەزاران ماڵ وێران بێ سەدان دێ كاول بێ، دەها شار لەبەین بچێ..

چونكە ئەمانە عەقیدەو بیروباوەڕیان نیە، وەزانایەكی سویسی ئەڵێت: وژدانێك كەعەقیدە سەرپەرستی نەكات وەكو دادگایەك وایە كە حاكمو قازی نەبێ.

## تكایەببورن:

لەوەی كە ئەگەر ووشەو كلماتی عەرەبی یا فارسیمان بەكار هێنابێ گرنگ پەندو ئامۆژگاریو دەرس وەرگرتنە لامان. ببەخشن..ببورن..